هەڵتەکاندنی گومانی خەواریجەکان لەسەر تەکفیر کردنی

# ابن تيمية رحمه الله تعالى

ئامادەکردن : ڕامان توحیدی سلفی

دیزاین : معاوية الكوردي



بسم الله الرحمن الرحيم

خەواریجەکان بەتەکفیرکردنی موەحیدان ڕانەوەستان ئێستا کۆمەڵی گومانیان هێناوە لەسەر ابن تیمیە تەکفیری ابن تیمیەی پێ دەکەن .

لێرە دا بەئیزنی الله وەڵامی درۆ و چەواشەکاریەکانیان ئە دەینەوە ...

بۆ زانیاریشتان ئەو گومانانە سەرەتا ڕافیزە دروستی کرد لەسەر ابن تیمیە پاشان سۆفیەکان ئێستاش خەوارجەکان لەوانیان وەرگرتوە هەندێ شتیان بۆ زیادکردوە تا خەڵکی لەو ڕێگا جوانەی شێخی ئیسلام دووربخەنەوە .

وەڵامی گومانەکانیان

*گومانی- یەکەم دەڵێن : ابن تیمیە بڕوای وایە کە پەیامبەران (علیهم السلام) کافر بوونە پێش وەحی پەنا بە الله ، لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەک دەنگ بوونە لەسەر ئەوەی پەیامبەران معصوم بوونە لە کوفر کردن پێش وەحی دوای وەحیش : (( مجموع الفتاوی ٢٩-١٥\٣٠ و مجموع الفتاوی ١٠\٣١٠، و مجموع الفتاوی ١٥/ ٣٠-٣١ و مجموع الفتاوی ١١/ ٦٩٠ ))

وەڵامی گومان : حاشا شێخی ئیسلام شتی وای هەرگیز نەوتووە بەڵکو خۆی ڕەدی ئەوانەی داوەتەوە کە دەڵێن دەکرێ پێغەمبەران پێش وەحی توشی هەڵە و تاوان بن فەرمویەتی رحمە الله لە مجموع الفتاوی (١٠/ ٢٩٣) : ( ئایا پێش هاتنی وەحی پێغەمبەران پارێزراون لە هەڵە یان نا وتوە لەسەر ئەم باسە ئەو وتەیەیە کە جەماوەری خەڵکی لەسەرین کە ئەوەش یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئاثاری سەلەف کە ئەویش جێگیرکردنی مەعصوم بوونی پێغەمبەرانە لە تاوان بە گشتی وە ڕەدانەوەیە بۆ ئەوانە کە دەڵێن دەکرێ پێغەمبەران تووشی تاوان بن ) .

ئەگەر ئەو خەواریجە درۆزنانە بڵێن ئەی ئەوە نییە لە تەفسیری ئایەتی ( أو لتعودن في ملتنا ) ئەو کاتە خەڵکە بێ باوەڕەکە بە شوعەیب و شوێنکەوتوانی وتیان یان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ ناو گەلەکەمان یان دەربەدەرت ئەکەین

خەوارجەکان دەڵێن ابن تیمیە دەڵی ڕووکەش ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە شوعەیب پێشتر لەسەر میلەتی گەلەکەی بووە ، ئەمەش تەکفیرکردنی پێغەمبەر شوعەیبە لەلایەن ابن تیمیە وە ، ئێمەش دەڵێین خوا ڕووتان ڕەشکات بۆگەنینە شێخی ئیسلام لەو قسەیە کە دەڵی ڕووکەش ئایەتەکە بەڵگەیە کە شوعەیب لەسەر میلەتی ئەوان بووە لە پێشتر مەبەستی بە میلەت دینی ئەو خەڵکە نییە . بەڵگەش هەر لە وتەی شێخی ئیسلام خۆیەتی کە فەرموویەتی لە بارەی شوعەیبەوە علیە السلام ، لە مجموع الفتاوی (٢٧/ ٥٠١) فەرموویەتی :

( وقد كان قبل البعثة يحج ويتصدق ويقري الضيف ويعين على نوائب الحق ولم يكن على دين قومه المشركين صلى الله عليه وعلى أصحابه وسلم تسليماً كثيراً )

پێش بوون بە پێغەمبەر حەجی دەکرد و صەدەقەی دەکرد وە ڕێزی لە میوان دەگرت وە یارمەتی دەری دەستەی هەقی دەکرد وە هەرگیز لەسەر ئاینی گەلە موشریکەکەی نەبووە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر خۆیی و هاوەڵانی بێت ...

ببینن لێرەدا مەبەستی شێخمان بۆ ڕوون بویەوە کە مەبەستی لەبەکارهێنانی وشەی میلەت دینی گەلەکە نییە .

زانایان تەفسیری وشەی میلەتیان بەم شێوە لێکداوەتەوە لەم ئایەتەدا نەك ئەو شێوەی کە خەوارجی کاڵ فام لێ تێگەشتوون .

الإمام برهان الدين البقاعي لە نظم الدرر : یان دەربەدەرتان دەکەین یان دەگەڕێنەوە بۆ میلەتەکەمان { في ملتنا } واتایانی بێ دەنگبن لەسەرمان هەروەك چۆن پێشتر بێ دەنگ بوون لەسەرمان وە (فی ملتنا) بە مانای گەڕانەوە نییە بۆ کوفر چونکە پێغەمبەر و پارێزراو بوو لە کوفر پێش پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرانی تریش سەلامی الله یان لێ بەڵکو گەلەکەی بێ دەنگ بوونی پێغەمبەرەکەیان لە پێشتردا بە ئەوە حسێب ئەکرد کە پێشتر لە میلەتی

ئەوان بووە چونکە پێش وەحی بێ دەنگ بوو لە جوێن و عەیبگرتن لە خوا کانیان جا مەبەستیان لە وتنی بگەڕێوە بۆ میلەتەکەمان مەبەستیان پێی ئەوە بووە کەبێ دەنگبێ لەسەریان وە قەناعەت بەشوێنکەوتوانی بکات کەبێ دەنگبن لەسەریان .

کەواتا ابن تیمیەش ڕوونی کردەوە کە پێغەمبەر شوعەیب تەنانەت پێش وەحی یش نە تاوانی کردووە نە کوفر وە کەواتا مەبەست لەوەی پێشتر لەسەر میلەتی ئەوان بووە ئەوەیە کە بقاعی و زانایانی تر باسیان کردوە کە قەومەکەی بێ دەنگبوونی شوعەیبیان لە پێش وەحی بەوە دانابوو کە شوعەیب لەسەر میلەتی ئەوانە بەڵام ابن تیمیە فەرمووی بە هیچ جۆرێ لەسەر دینی ئەو میلەتە موشریکە نەبووە .

کەوایا کێشە لە وتەکەی شێخ نییە چونکە بە کۆکردنەوەی وتەکانی شێخ تێگەشتین لە مەبەستی شێخ ، بەڵام کێشەی خەواریجی کۆن و نوێ تێنەگەشتنیانە لە مەبەستی وشەکانی قورئان بۆیە بە عەقڵ خۆیان لێکی ئەدەنەوە دێن بەو شێوە تەکفیری ابن تیمیە دەکەن هەروەك چۆن پێشتر ئیمام علی یان تەکفیر کرد بە تێنەگەشتنیان لە دەقەکان .

*گومانی دووەم خەواریجەکان دەڵێن : ابن تیمیە کافرە چونکە ابن تیمیە پێی جائیزە کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتی ڕافضیەکان بکرێ ، لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەک دەنگ بوونە لەسەر حەرامیەتی زەواج لە گەڵیان : بەڵگە : (( مجموع الفتاوی ٣٢\٦١ ))

جا ئەی خوێنەری بەڕێز سەیری درۆ و چەواشەکاری ئەو خەواریجانە بکەن من ئێستا ئەو فەتوایەی ئەوان کردویانەتە بەڵگە دەڵێن ابن تیمیە بە جائیزی داناوە زەواج لەگەڵ ڕافیزە من هەر ئەو فەتوایەتان بۆ دێنم بزانم ئایا شێخ الاسلام وتوویەتی جائیزە ؟ یان خەواریجەکان درۆ ئەکەن و بێ ئاگان تەنها وەك توتی کۆپی پەیستێکیان لە ڕافیزە و سۆفیەکان وەرگرتووە بۆ تەکفیری ئەو زانا بەرێزە بە درۆ و و بە جەهل و بە چەواشەکاری ، سەیری فەتواکەی شێخ بکەن : وقد سئل شیخ الإسلام ابن تیمیة رحمه الله : عن الرافضة هل تزوَّج ؟.

پرسیارکرا لە شیخ الاسلام ابن تیمیە رحمە اللە لە بارەی زەواج کردن لەگەڵ ڕافیزە دا

فأجاب : له وەڵامدا فەرمووی : (( الرافضة المحضة هم أهل أهواء وبدع وضلال ، ولا ينبغي للمسلم أن يزوِّج موليته من رافضي. و إن تزوج هو رافضية : صح النكاح ، إن كان يرجو أن تتوب ، وإلا فترك نكاحها لئلا تفسد عليه ولده )) ڕافیزە تەواوەکان ئەوانەی خاوەن بیدعە و هەوا و ئارەزوو و گومڕاییین دروست نییە موسڵمان زەواجیان لەگەڵ بکات ئەگەر زەواجی کرد و ڕافیزە دەرچوو ئەوا زەواجەکە دروستە ئەگەر ئومێدی تەوبەکردنی هەبێ بەڵام ئەگەر ئومێد نەبوو تەوبە بکات ئەوا واز لەو زەواجە دەهێنێت بۆ ئەوەی منداڵەکانی خراپ نەبێت بە هۆی ئەوەوە . هەمان سەرچاوە کە خەواریجەکان ئاماژەیان پێ کرد مجموع الفتاوى " ( ٣٢ / ٦١ )

هەر لە هەمان شوێن شێخ فەرموویەتی : لا يجوز لأحد أن ينكح موليته رافضياً ولا من يترك الصلاة، ومتى زوجوه على أنه سني فصلى الخمس، ثم ظهر أنه رافضي لا يصلي، أو عاد إلى الرفض وترك الصلاة فإنهم يفسخون النكاح . دروست نییە کە زەواج بکرێ لەگەڵ ڕافیزە و ئەوە کەسەی کە نوێژ ناکات جا ئەگەر کەسێ زەواجی کرد وای زانی ئەو کەسە اهل سونەیە و پێنج فەرزە نوێژەکە ئەکات پاشان بە دەرکەوت کە سونی نییە و ڕافیزەیە و نوێژ ناکات یان بگەڕێتەوە بۆ بوون بە ڕافیزە و واز لە نوێژ بهێنێت ئەوا زواجەکەیان هەڵئەوەشێتەوە . جا ببینن شیخ بەحەرامی دانا لە هەموو حاڵەتێ تەنها لە یەك حاڵەت ئەویش بە یەك مەرج ڕێگەی پێ دا ئەگەر کابرا زواج بکات و دواتر بۆی دەرکەوێ بزانێ ژنەکە ڕافیزەیە لەو کاتەدا ئەگەر ئومێد هەبێ ئەو ژنە تەوبە بکات و ببێتە موەحید ئەوا زواجەکە دروستە وە ئەگەر بزانێ نابێتە موەحید و ملکەچ نابێ شێخ بە حەرامی داناوە وە فەرمووی ئەو زواجە باتڵە هەڵئەوەشیتەوە وە وای داناوە ئەو زەواجە خراپە و زیانی دەدات لە منداڵەکان ئیتر بە چی عەقڵی شێخ شتێ حەڵاڵ دەکات کە خۆی دەڵێ حەرامە و باتڵە و هەڵئەوەشێتەو و خراپە و زیانی هەیە بۆ عقیدەی مندالی موسڵمان ؟ والله هەر کەس بڕوا بە قسەی ئەو خەواریجانە بکات لەوان بێ عەقڵتر و جاهلترە هەر شایستەی ئەوەیە ببێتە ئەهلی دۆزەخ . ئایا شەرم ناکەن خەوارجەکان ؟ ئایا ئارەقی شەرمەزاری دەرنابڕن ؟

*گومانی سێ یەم : دە بەڵگە بۆ هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی سێهەمی خەواریجەکان هەڵتەکاندنی گومانی خەواریجەکان لەسەر تەکفیرکردنی ابن تیمیەی شێخمان دەڵێن ابن تیمیە پەشیمان بۆتەوە لە عەقیدەیَ اهل السنە بە ئەشعەری مردووە دەشلێن بەڵگەمان ئەوەیە لە ساڵی ٧٠٧ کۆچی لە مناقشەی لەگەڵ کۆمەڵێ لە ئەشعەریەکان نەفی ئەوەی کردووە خوا لەسەر عەرش بێت وە لەسەر ئەوەش مردووە کە دەکاتە ساڵی ٧٢٨ کۆچی

ئێمەش دەڵێن لە وەڵامدا : ئەگەر شێخ لەساڵی ٧٠٧ کۆچی وای وتبێت ئەوا کتابی منهاج السنەی لە ساڵی ٧٢٠ نووسی کە تێیدا اثبات علوی خوا ئەکات لەسەر عەڕش و ڕەد ئەشعەریەکان ئەداتەوە ، وە جێگیربووە کە شێخ لە دوای ئەو ساڵە چەندان کتێبی نووسیوە کە نەفی و ڕەدی عقیدەی ئەشعەری بەگشتی ئەکاتەوە لەوانەش :

القاعدة المراكشية

والرد على المنطقيين

والنبوات

والفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان

والجواب الصحيح

والصفدية

وشرح الأصبهانية

والرسالة البعلبكية

جا شەرم بتان گرێ خەوارجە ڕوو ڕەشەکان

پاشان ابن قیم لە ساڵی 712 شێخ الاسلامی بینی و بووە قوتابی شێخ کەچی ابن قیم تەنها عقیدەیَ اهل السنە لە شێخەوە باس ئەکات و بە یەك وشەش ئاماژە بەوە نادات شێخ موافقەی ئەشعەریەکانی کردبێت . ئەو قسانە قسەی کابرایەکی جەهمی ئەشعەریە بۆ بانگەشەکردن بۆ ئەشعەریەت هەستاوە بە داڕشتنی چەند درۆیەك کە گوایە ابن تیمیەش

ئەشعەری بووە ، جا خەوارجە جاهلەکانیش بێ لێکوڵینەوە یەك سەر وەریان گرتووە و هاتوون تەکفیری ابن تیمیەی لەسەر ئەکەن وەڵام بۆ ئەو گومانە :

یەکەم : نوسرا و وتە و گەڕانەوەی هیچ زانایەك چەسپاو نابێت ئیلا بەوە نەبێت بە سەندێکی سەحیح جێگیر بوو بێت جا ئەوانەی ئەم قسەیە دەکەین ناتوانن بەسەندێکی سەحیح بیسەلمێنن .

دووەم : ئەو کتێبانەی شێخ الاسلام نووسیویەتی پڕا و پڕ پێچەوانەی ئەو قسانەیە کە گوایە شێخ لەسەر عەقیدەی ئەشعری بووە .

سێهەم : لە کتیب و نوسراوەکانی شێخ هیچ ئاماژەیەك نەکراوە کە بووبێتەوە بە ئەشعەری وە هیچ قوتابیەکی لە پاش مردنی شتی وای نەوتووە .

چوارەم : لە سەردەمی شێخ دا ئەشعەری و فەلسەفیەکان زۆر هەوڵیان ئەدا درۆ بە دەم شێخەوە بکەن کە گوایە شێخ وازی لە عەقیدەکەی خۆی هێناوە و وەك ئەشعەریەکانی لێهاتووە بەڵام شێخ ڕەدی ئەوانی بە توندی داوەتەوە کە بۆتە ڕەدێك بۆ خەواریجەکانی ئێستاش ، وە هۆکاری ئەو زیندانەی شێخ چی بوو ؟ کەرسالە التسعینەی نووسی ؟ شێخیان زیندانی کرد تاکو نەفی بەرزی خوا بکات لەسەر عەرش وە نەفی وەجە بکات وە نەفی قسەکردنی خوا بکات ، وە داوایان لێ کرد شێخ عەقیدەکەی خۆی بگۆڕێ ، بۆیە شێخ رسالە التسعینەی نووسی کە باس لەوە ئەکات ئەوان داوای ئەوەیان کردوە شێخ نەفی وجە و علو و قسەکردنی خوا بکات بڕوانە رسالە التسعينية ١/ ١١٣ وە هەروەها المجموع ٥/ ٢٦٤

وە شێخ ڕەدی دانەوە و فەرمووی : لەم نوسراوەم دا هەندێ شتم نووسی کە پەیوەستن بەو میحنەتەوە کە لەم ڕۆژە دا داوایان لێمکرد وە منیش ڕوونم کردەوە کە ئەو داواکاریانە گۆڕینی دینە و شوێنکەوتنی جگە لە ڕێگای ئیماندارانە جا ئێمەش بۆ سوود گەیاند بۆ موسڵمان لە چەند ڕوویەکی زۆرەوە ئەمانە دەنوسین .

جا شێخ لە ڕەدی ئەو درۆیانەی درایە پاڵی کە دەیانووت شێخ پەشیمان بۆتەوە لە عقیدەکەی بۆتەوە بە ئەشعەری شێخ لە ڕەدی نامەیەکدا کە بۆی هاتبوو لە مانگی ڕەمەزان لە یەکێ لە زیندانەکانی مصر باس لە گفتوگۆی نێوان خۆی و یەکێ لەو ئەشعەریانە ئەکات

له مجموع الفتاوى ٣/ ٢١٥ فەرمووی : بەم شێوەیە کاتێ قسەم کرد لەگەڵ أمين الرسول علاء الدين الطيبرسي کە پێی وتم ئەم باسە هەق تێدا بۆ کەس نییە ئیلا الله و رسولەکەی و تێکڕای موسڵمانانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات نەبێت وە من ناتوانم دینەکەم بگۆڕم وە ئاڵای موسڵمانان بشکێنم وە لە دین مورتەد ببمەوە لەبەر خاتری فلان و فلان بەڵی ئەتوانم نەفسی خۆم سەرنەخەم وە ڕێگەش نەدەم کەس خراپەم بەرامبەر بکات و درۆم بۆ هەڵبەستێ وە بە دوای حەزەکانی خۆم ناکەوم وە مەبەستم زیان گەیاندن نییە بە کەس ئەمانەش لەمنەوە دەرچوونە سوپاس بۆ الله وە نەفیسشم بەوە ئارامە جا پێیم وت من ئیتر لەچی بترسم ؟ ئەگەر بکوژرێم لە شەهیدە چاکەکان ئەبم وە ڕەحمەت و ڕەزامەندی خوام بۆدێ تا ڕۆژی قیامەت وە ئەوەشی دەمکوژێ نەفرەتی اللەی بە هەمیشەی بۆدێ لە دونیا و لە سزای ئاخیرەت جا با هەموو ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دواییە چاك بزانن ئەگەر من کوژرام لە پێناو دینی الله کوژراوم ئەگەر زیندان بکرێم زیندان بۆ من لە نیعمەتە گەورەکانی خوایە بەسەرمەوە وە والله ناتوانم سوپاسی الله بکەم لەسەر ئەم نیعمەتەکانی لەم زیندانیەمدا

وە من هیچ لەو شتانەم نییە کە خەڵکی دەترسن لە دەستی بدەن نە ماڵ و نە سەرکردایەتی و نە دەسەڵات نە قوتابخانە .. ئەوجا پێمی وت تۆ لە چوار مەزهەبەکە دەترسیت ئەوجا باسی حوکمی چوار قازی هەر چوار مەزهەبەکەی کرد

منیش پێیم وت ئەوەی من وتوومە ئەوەیە کە چوار پیشەواکە لەسەری بونە وە لە شام زیاتر ل پەنجا کتێبی شافعی و مالکیەکان و حەنەفیەکان و اهل حەدیثم خوێندەوە هەمووی هاو بۆ چوونە لەگەڵ ئەو قسانەی کە من دەیلێم وشە بە وشە پێچەوانکارم ناتوانن شتێ دەربێنن لەو کتێبانە کە پێچەوانەی قسەکانی من بێت و هەڵی وشێننتەوە ، جا کاتێ ( ئەو نوسراوەی کە نوسرابوو درابویە پاڵ شێخ ) شێخ ئەڵێت خوێندمەوە و بیرم لێی کردەوە وتم پێی ئەمە هەمووی درۆیە ئیلا یەك وشە تێیدا ڕاستە و عەقیدەی منە کە ئەویش ئەوەیە خوا لەسەر عەرشە بە هەقیقەت بەڵام بێ شوبهاندن و بێ چۆنیەتی پاشان پێی وتم ( کابرای ئەشعەری وتی ) ئەو قسەیەت بنووسە بۆم بە دەستی خۆت منیش پێیم وت ئەوە پێشتر

نوسراوه له عەقیده دا شتێکم نەوتوه پێچەوانەبێت ئیتر چی سودێك هەیە له دووباره نوسینەوه ؟ وه وتم پێی ئەو وشەیەی من وتم ئیجماعی اهل السنه و الجماعەی لەسەره له مالکیەکان و شافعیەکان و اهل الحدیث وه هیچ زانایەکی ئیسلام انکاری له وەنەکردوه که من وتوومه ئیلا ئەو ناکۆکی کارانه نەبێت . ببینه شێخ ڕەدی ئەو درۆیەی دایەوه هەر لەسەر دەمی خۆیدا .

پێنجەم : له ڕەدی ئەو گومانەی خەوارج ئەوەیه قوتابیەکانی شێخ نەفی ئەوه دەکەن شێخ له عەقیدەکەی پاشگەزبوو بێتەوه که لەسەری زیندان کراوه . الحافظ الذهبي له المعجم المختص ئەلێت وتم شێخ زیندان کرا زیاد له جارێ بۆ ئەوەی وازبێنێت له ناکۆکی کارانی بەڵام شێخ پاشگەزنەبوویەوه تا ئەو کاتەی که مرد رحمه الله .

وه له وەسفی شێخ ذەهەبی وتوویەتی شێخ دامەزراو بوو تەنازول و ئاسانکاری نەدەکرد هەقی تاڵی دەوت ئەو هەقەکەی که اجتهادەکەی پێی گەیاند وه زیرەکیەکەی له چوارچێوەی سوننەکان و وتەکان .

جا من پێم سەیره قوتابیەکانی نەفی ئەوه دەکەن وه ساڵەکان و کتێبەکان شێخ نەفی ئەو درۆیه ئەکەن کەچی خەوارجی بێ ئابڕوو هەر ئەو درۆیه ئەکەن !

شەشەم : له هەڵوەشاندنەوەی گومانی خەوارجەکان شێخ هەموو کات توشی تەنگانه و زیندان و ئازار دەبویەوه پێش ساڵی ٧٠٧ و له دوای ئەو ساڵەش بەهۆی وته و عەقیدەکەی شێخ پەشیمان نەدەبوویەوه ئیلا هەندێ کات له مەسەلەی تەڵاق بێ دەنگ ئەبوو ماوەیەك پاشان دەیوت من چۆن علم بشارمەوه پاشان دەستی پێ ئەکردەوه ، بڕوانه ( العقود٣٢٥ ) جا ئەگەر شێخ خۆی نەگرێ له باسی تەڵاق هەر باسی بکات ئایا به چی عەقڵی کەوه دەکرێ شێخ له عەقیدەیەك پاشگەز بێتەوه که دەیان کتێب و چەندان ساڵ زیندانی لەسەرخواردوه ؟

حەوتەم : ئەم درۆ دانه به پاڵ شێخ الاسلام ابن تیمیه چەندان جار بۆی کراوه خۆشی و قوتابیەکانی باسیان کردوه ، بڕوانه پەڕەکانی العقود ٢٠٠، ٢٠٤، ٢٠٩،٣٢٨، ٢٠٧ .

ابن تيميه خۆی فەرمویەتی رحمه الله له الموضع الثالث : (( پێم گەیشتووەکه کتێبیکیان به ناوی منەوە بردوە بۆ امیر رکن الدین جاشنکیر ئەو کتێبەش پڕە لە عەقیدەی لادەرە من هیچ ئاگام لێی نییه ئیلا ئەوە نەبێت کە دەزانم ئەوە درۆیه ( به ناوی منەوەکراوە ) الشيخ له الموضع الرابع : فەرمووی : (( أنا أعلم أن أقواماً يكذبون علي كما قد كذبوا علي غير مرة .. ))

من گەلێك دەناسم درۆم بە دەمەوە ئەکەن وەك چۆن درۆیان بە دەممەوە کردوە جگه لە جارێك

ابن عبد الهادي له الموضع الأخير : ئەفەرمووێ بە هەموو شێوەیەك شێخ هێرش ئەکرایه سەر شێخ وە قسەیان بۆ هەڵدەبەست شتانێکیان دەدایه پاڵی کە خۆی نەیوتووە لە ووتانە زۆرتر بڕوانه ((التسعينية ١/ ١١١و الإخنائية ١٠٤-١٠٥ و المجموع ٣/ ٢١٠ و٣/ ١٦١-١٦٤ و٦/ ٣٧٥ وموقف ابن تيميه من الأشاعرة ١/ ١٧٩-١٨٠ حاشية )) جا هیچ سەیر نەبێ بەلاتەوە کە ئەو درۆیه بدەنە پاڵ شێخ کە ناتوانن بەیەك وشە لە شێخەوە یان لە قوتابیەکانیەوە بیسەلمێنن کە شێخ بووبێت بە اشعری .

هەشتەم : کۆمەڵێکی گەورە لە زانایانی مێژوو لەو سەردەمەی شێخدا هەبوونە لە قوتابیەکانی شیخ وە لەو مێژوونوسانەی کە لە دواتریش هاتبوون کەسیان باسی ئەوەیان نەکردوە شێخ لە عەقیدەکەی پەشیمان بووبێتەوە بووبێت بە ئەشعەری بەڵکو بە پێچەوانەوە با بزانین ئەو ڕۆژ و مانگ و ساڵەی کە دەدرێتە پاڵ شێخ گوایە شێخ لە عقیدەکەی پەشیمان بۆتەوە بابزانین لەو ڕۆژەدا چی ڕوویداوە .

(( یەکەم )) البرزالي الشافعي مێژوونوسی شامی وە فەرموودەناسی الإسلام لە مێژوەکەیدا ٢١٣- ٢١٥ باسی ڕوداوەکانی ئەو ڕۆژە دەکات و فەرموویەتی : (( لە سەرەتاکانی ڕبیع الاول امیر حسام الدین مهنا بن عیسی گەشتە دیمەشق وە چوو بەرە و قاهیرە وە لە ١٩ ی ربیع الاول گەشتە ئەوێ وە چوو بۆ لای زیندان چوو بۆ لای شێخ تقی الدین ابن تیمیه شێخی دەرهێنا لە زیندان وە ڕۆژی هەینی ڕۆژانی ٢٢ و ٢٣ ی ئەو مانگە دەرچوون بۆ ماڵی نائب السلطنه لە قلعه وە کۆمەڵی لە فوقەهاکان ئامادەبوون وە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ڕوویدا لە

نێوانیان پاشان نوێژی هەینی جیای کردنەوە پاشان بۆ ئیوارە کۆبوونەوە پاشان ئامادەبوون بۆ مەراسیمی سوڵتان لە ڕۆژی یەك شەممە ٢٥ ربیع الاول ٧٠٧ ی کۆچی ( ئەو بەروارەی خەوارج دەڵێن شێخ تێدا پەشیمانی تێدا دەربڕیوە لە عەقیدەکەی ) وە جەماعەتێکی زۆر ئامادەبوون لە ئامادەبووان نجم الدین بن الرفعة و علاء الدین الباجي، وفخر الدین ابن بنت أبي سعد، وعز الدین النمراوي، وشمس الدین بن عدنان وصهر المالكي وە جەماعەتێ لە فوقەهاکان بەڵام قازییەکان ئامادە نەبوون و عوزریان هێنایەوە کە نەخۆشن وە نائب سوڵتان عوزرەکەیانی وەرگرت زۆری لێیان نەکرد وە ئەو مەجلسە کۆتای پێ هات لەسەر خێر وە شیخ ابن تیمیە مایەوە لە لای نائب السلطان وە نامەیەکی نوسی بۆ دیمەشق لەبەرە بەیانی ٢٦ ی ڕبیع الاول لە نامەکەدا باس لەوە ئەکات کە ئازاد بووە لە زیندان وە لە مالێ ابن شقیرە لە قاهیرە وە امیر سیف الدین بن سلار پاشان شێخ ئامادەی دانیشتی سێهەمیش بوو لەڕۆژی پێنج شەمە ٢٦ ربیع الاول لە مدرسەی الصالحیە لەقاهیرە ))

جا ئەوەتا مێژوو نوسەکان ئاگاداری دانیشتن و نامەکان شێخ بوونە لەوژوژو ساڵ و مانگە بۆچی بە یەك وشەش شتیکی ئاوایان باس نەکردوە ؟؟

چونکە شت دانە پاڵ عالم دەبێ یەکێ لەو شتانەی تێدا بێت بۆ ڕاستی هەواڵەکە یان بە سەنەدێکی سەحیح یان مێژویەکی سەحیح و بە هێز و پاڵپشت لێکراوبێت بە سەنەدێ سەحیح نەك لاواز و هەڵبەستراو یان بەوتەی شێخ لە کتێب خۆیدا یان بەوەی قوتابیەکانی بیدەنە پاڵی ئێ ئەم ڕووداوە هیچ یەکێ لەوانەی تێدانییە !!

(( دووەم )) الحافظ ابن کثیر الشافعي لە عمدة المؤرخین وعلم المفسرین هیچ شتێکی لەو ڕووداوە درۆیەی خەوارجی باس نەکردوە بەڵکو ئەویش هەمان شتی وتووە کە مێژوونوسانی تر وتوویانە"البدایة والنهایة (( فلما كان يوم الجمعة الثالث والعشرين من ربيع الأول جاء الأمير حسام الدين مهنا بن عيسى ملك العرب إلى السجن بنفسه وأقسم على الشيخ تقي الدين ليخرجن إليه، فلما خرج أقسم عليه ليأتين معه إلى دار سلار، فاجتمع به بعض الفقهاء بدار سلار وجرت بينهم بحوث كثيرة.

ثم فرقت بينهم الصلاة، ثم اجتمعوا إلى المغرب وبات الشيخ تقي الدين عند سلار، ثم اجتمعوا يوم الأحد-[وهو ٢٥ ربيع الأول الذي يزعمون أنه وقعت فيه الانتكاسة]- بمرسوم السلطان جميع النهار، ولم يحضر أحد من القضاة بل اجتمع من الفقهاء خلق كثير، أكثر من كل يوم، منهم الفقيه نجم الدين بن رفع وعلاء الدين التاجي، وفخر الدين ابن بنت أبي سعد، وعز الدين النمراوي، وشمس الدين بن عدنان وجماعة من الفقهاء وطلبوا القضاة فاعتذروا بأعذار، بعضهم بالمرض، وبعضهم بغيره، لمعرفتهم بما ابن تيمية منطوي عليه من العلوم والأدلة، وأن أحدا من الحاضرين لا يطيقه، فقبل عذرهم نائب السلطنة ولم يكلفهم الحضور بعد أن رسم السلطان بحضورهم وانفصل المجلس على خير، وبات الشيخ عند نائب السلطنة وجاء الأمير حسام الدين مهنا يريد أن يستصحب الشيخ تقي الدين معه إلى دمشق، فأشار سلار بإقامة الشيخ بمصر عنده ليرى الناس فضله وعلمه، وينتفع الناس به ويشتغلوا عليه .وكتب الشيخ كتابا إلى الشام يتضمن ما وقع له من الأمور ...))

(( سێ یەم )) الدواداري — مێژوونوس ( مردوه لەدوای ساڵی ٧٣٦ ) له " كنـز الدرر" الجامع ٢٣٩ هەمان شت ئەڵێت کە ذكر البرزالي و ابن كثير باسيان كردوه .

(( چوارەم )) الحافظ ابن عبدالهادي الحنبلي قوتابی ابن تیمیه هەمان شت باس ئەکاتەوە له (العقود الدرية ١٩٧ )

(( پێنجەم )) الذهبي مێژوو نوسی ئیسلام و قوتابی شێخ هەمان شت باس ئەکات و قسەی خەوارج هەڵئەوەشێنتەوە .

(( شەشەم )) الحافظ ابن رجب الحنبلي (٧٩٥) له"الذيل - الجامع : ٤٧٦-٤٧٧" هەمان شت دەگێڕێتەوە هیچ شتێکی نەگێڕاوەتەوە ئاماژە بکات گوایە ابن تیمیە بۆتە بە ئەشعری و پەشیمان بۆتەوە لە عقیدەکەی (العقود) ئەڵێت لە ربیعی یەکەم ساڵی ٧٠٧ عیسا بن امیر العرب هات بۆ مصر وە چوو بۆ سجن و شێخی دەرهێنا لەگەڵ خۆی وە بۆ شێخی ئامادەکرد دانشتێك کە گەورەکان تێیدا ئامادەبوون وە دانیشتەکە بە خێر کۆتایی هات زەهەبی و البرزالی و جگە لەوانیش دەیگێڕنەوە کە شێخ نوسراوێکی بۆیان نوسی نوسراوێکی

مجمل ( كۆمەڵی واتا هەڵگر ) هەندێ وشەی تێدابوو مجمل بوو شێخ نوسیەی کاتێك هەڕەشەی لێکرا بە کوشتن .

کە واتا شێخ پەشیمان نەبۆتەوە لە عەقیدەکەی ئەگەر شتێکی نوسی بێت لە ژێر هەڕەشەی کوشتن بووە کە بە اجماع خەوارج و مورجیئە و اهل السنه و هەموو تائیفەکان ئەنجامدانی کوفر لە ژێر هەڕەشەی کوشتن بە کوفر حساب ناکرێ لەسەر خاوەنەکەی چ جای تەکفیربکرێ لەسەری چ جای نوسینەکەی شێخ وەك باسکرا مانا هەڵگربووە وتەی سەڕیح و ڕوون نەبووە !

(( حەوتەم )) المقريزي الشافعي مێژوونوسی گەورە لە المقفى الكبير - الجامع :٥٠٧" هیچ شتێکی باس نەکردوە کە شێخ لە عەقیدەکەی پەشیمان بووبێتەوە بووبێت بە ئەشعری بەڵکو هەمان شتی زاناکانی وتۆتەوە کە ئەویش وتەی مجمل بوون پاشان بەوەش ڕازی نەبوون خۆیان هەندێ شتیان بۆ زیاد کرد و پاشان لە ژێر هەڕەشە ئیمزایان بە شێخ کرد ئەوەشی بە شێخ نوسرا لە وتەکانی خۆی وتەی ڕوون نەبوون ئەویش لە ژێر هەڕەشەی کوشتن پێی نوسراوە .

شتێکی زانراویشە هەر شتێ بە زۆر بە کەسێ بکرێت نابێتە ماڵ بەسەر خاوەنەکەیەوە وە شێخ خۆی بە کتێب ڕەدی داونەتەوە لە دواتر دا بە رساله التسعينيه و کتێبەکانی تری جا ئایا خەوارجی بێ ئابڕوو شتێك دەداتە پاڵ زانایەکی ئاوا گەورە کە خۆی نەینوسی بێت و بۆیان نوسی بێت و لەژێر هەڕەشەی کوشتن ئیمزایان پێکرد بێ ئایە ئەمە دەبێتە ماڵ بەسەر خاوەنەکەی ، ئەی عوزری زۆر لێکردن بۆ کوێ چوو ؟؟

نۆیەم : کە شێخ پەشیمان نەبۆتەوە لە عەقیدەکەی ئەوەی پێیکراوە لە ژێر هەڕەشە بووە ئەوەیە کە ساڵی دواتر هاتن داوایان لە شێخ کرد ئەو شتانەیَ نوسیویەتی لە عقیده بنوسێت و بیداتە پاڵ ئیمام احمد نەك پاڵ هەموو سەلەف بەڵام شێخ ڕەدی کردەوە بە ئاشکرا وتی ئەوە عقیدەی سەلەفە کە واتا ئەمە هەڵوەشاندنەوەیە بۆ قسەی خەوارجەکان ئایا چۆن دەکرێ شێخ لە عقیدەیەك پەشیمان بووبێتە بەڵام ساڵی دواتر ئەو عەقیدە بداتە پاڵ سەلەف و

ئەشعەریەکانیش بێن داوای لێ بکەن ئەو عەقیدەیە نەداتە پاڵ سەلەف بڕوانە ( العقود ٢١٨-٢٤٠،٢١٥-٢٤١

دەیەم : هەر لەساڵی ٧٠٨ هاتن داوایان کرد لە شێخ کە عەقیدەیەك بنوسێت و بیبە بۆ سوڵتان و داوایان کرد کە شێخ بڵی خوا لەسەر عەڕش نییە و خوا قسە ناکات شێخ وەڵامی دانەوە و فەرمووی : داوام لێ ئەکەن کتێبێك بنوسم بە دەستی خۆم کە بلێم خوایەك نییە بپەرسترێ لەسەر عەڕش وە لە موصحەفەکان قورئان نییە وە خوا هیچ وتەیەکی نییە لەسەر زەوی ؟ عەمامەکەی دایە زەویا و هەستایە سەرپێ وسەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی ئەی خوایە من تۆ ئەکەمە شاهید ئەمانە بانگم ئەکەن کە بێ باوەڕبم بە تۆ و بە کتێبەکەت و پێغەمبەرەکەت صلی الله علیه وسلم وە ئەوەش من نایکەم پاشان دوعای لێکردن .
فقال لهم شيخ الإسلام : تدعونني أن أكتب بخطي أنه ليس فوق العرش إلــه يعبد ،ولا في المصاحف قرآن ، ولا لله في الأرض كلام ؟! ودق بعمامته الأرض ، وقام واقفا ورفع رأسه إلى السماء وقال : اللهم إنـي أشهدك على أنهم يدعونني أن أكفر بك وبكتابك ورسلك ، وأن هذا شيء ما أعمله ...)) ثم دعا عليهم .

ئەوجا وتی ئەوان وتیان ئەگەر موافەقەمان نەکەی ئەوان یان دەتکوژن یان زیندانت ئەکەن یان دەربەدەر ئەویش پێیانی فەرموو : (( أنا إن قتلت كانت لي شهادة ، وإن نفوني كانت لي هجرة ...)) من ئەگەر بکوژرێم بۆ شەهیدی ئەگەریش دەربەدەرم بکەن بۆم هیجرەتە فيئسوا منه وانصرفوا. ئەوجا ئەوانیش لێی بێ ئومێد بوون ( ذكره إبراهيم الغياني خادم شيخ الإسلام - الجامع ١٤٧-١٤٨ ) .

کە واتا شوبهەی خەوارجەکان هەڵوەشایەوە شێخ الاسلام نەك هەر پەشیمان نەبۆتەوە لە عەقیدەکەی بەڵکو لەسەریشی مرد و جیهادی لە پێناو دا کرد ئەوەی هەیە تەنها ئەوەیە کە شێخ لە ژێر هەڕەشەی کوشتن ئیمزایەکی پێکراوە لەسەر نوسینێك وە دواتر شێخ ڕەدی داوەتەوە و بەرائەتی لێکردوە چونکە شێخیش مرۆڤە هەندێ کات توش لاوازی دەبێت وە پێدەچی بەهۆی زۆری ئازارەکانی لە زیندان توانای بەرگەگرتنی نەما بێت بۆیە لە ژێر هەڕەشەی کوشتن ئیمزای قسەی ئەشعەریەکانی کرد وەك البرزالی و ذهبی و مێژوونوسەکان

وتیان له ژێر هەڕەشەی کوشتن ئیمزای پێ کراوە بۆیە حاڵەتی ئیکراه خوا بە عوزری شتێ الله بە عوزری داناوە خەوارجەکان خاوەنەکەی پێ تکفیر ئەکەن سەرەڕای ئەوەی شێخ دوای ئەوە دەیان کتێبی نوسی بەس بۆ ڕەدانەوە یان هەر ڕەدیانی دایەوە وەك باسمان کرد چونکە پەشیمان بوونەوە ئەوەیە کابرا بە هەڵبژاردەی خۆی شتێ بلێ نەك لە ژێر هەڕەشەی کوشتن دەیان کتێبی نوسێ و ڕەدی ئەو قسانەی دایەوە و خۆی دیسان خستە زیندانەوە لەو پێناوە دا رحمەت الله لە برای خۆشەویست و زانای گەورەم شیخی ئیسلام ابن تیمیە شاهیدی ئەدەین شێخ تا مردنی جیهادی کرد لە پێناو عەقیدەی سەلەف بە ئەندازەی مویەك لای نەداوە بە هەڵبژاردە و ویسیتی خۆی .

*گومانی چوارەم : ئابڕووبردنی خەواریجە جاهیلەکان لەسەر تەکفیرکردنی شیخی ئیسلام ابن تیمیە خەواریجە جاهیلەکان ئەم جارەیان شتێکیان داوەتە پاڵ ابن تیمیە و تەکفیری ابن تیمیەی لەسەر دەکەن کە خودی سەرچاوەی بەڵگەکەیان ڕەدە لەسەر خۆیان دەڵێن : ابن تیمیە وای دا ئەنێت دۆزەخ ئەکوژێتەوە ! لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەک دەنگ بوونە لەسەر ئەوەی کە دۆزەخ کوژانەوەی بۆ نییە : بەڵگە (( الرد على من قال بفناء النار ص٦٧ و مجموع الفتاوى ١٨\٣٠٧ )) ببینە ئەی خوێنەری بەڕێز سەیری ناونیشان کتێبەکەی شێخ بکەن الرد على من قال بفناء النار واتا ڕەدانەوەی ئەوانەی دەلین ئاگری دۆزەخ لە ناو دەچێت .

بەس ناونیشانی کتێبەکەی شێخ بەڵگەیە لەسەر درۆکەی خەوارج ناونیشانی دووهەمەیش مجموع الفتاوى ١٨\٣٠٧ با بچین بزان شێخ لەو ناونیشانە شتی وای وتووە ؟ چونکە خەواریجەکان بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك چونکە جاهلن و توانای لێکۆڵینەوەیان نییە هەر چی بیبینن یەکسەر کۆپی پەیستی ئەکەن بۆیە دەبینی هەموو جارێ درۆکانیان ئاشکرا دەبێت سوك دەکرێن ، ئێستا با بزانین ئایا شێخ لەو لاپەڕە و لە کتێبەی کە خەواریج وتیان ابن تیمیە لەو جێگایە دەڵی دۆزەخ لە ناو ئەچێ بابزانین ڕاست ئەکەن یان درۆ ، شێخ لە مجموع الفتاوى ١٨\٣٠٧ فەرموویەتی : زانایانی سەلەفی ئومەت و پێشەوایانی یەکدەنگن وە هەموو اهل السنه یەکدەنگن کە هەیە لە دروستکراوەکانی خوا هەرگیز لەناو ناچێت و کۆتای

نایەت بە تەواوی وەك بەهەشت و ئاگری دۆزەخ و عەرشی خوا و جگە لەوانەش وە هیچ کەسێ نەیوتووە هەموو دروستکراوەکان لەناو ئەچن ئیلا کۆمەڵی لە ئەهلی کەلام و بیدعەچیەکان نەبێت وەك جەهمی کوڕی صەفوان وە ئەوانەشی موافقەی ئەویان کردوە لە موعتەزیلە و هاوشێوەکانیان وە ئەو وتەیەش وتەیەکی باطلە پێچەوانەی کتابی الله و سونەتی رسولە صلی الله علیه وسلم وە پێچەوانەی ئیجماعی سەلەف و پێشەوایانە .

جا ببینە شێخ اجماعی سەلەفی نەقڵ کرد کە بەهەشت و دۆزەخ و عەرش هەرگیز لەناو ناچن ئەوەشی پێچەوانەی ئەوە بڵی بەجەهمی و موعتەزیلە وەسفی کرد ئیتر نازانم خەوارجی بێ ئابڕوو ئەم درۆیەی چۆن دایە پاڵ شێخ کە لە خوا ناترسن هەر شەرمی ئاشکرا بوونی درۆکەتان بتانگرێ ، خەوارجی کۆن لە ئێوە باشتربوون چونکە ئەوان درۆیان بە کوفر دەزانی ئێوە درۆکردن لاتان بۆتە عیبادەت بە درۆ خەڵك گومڕا دەکەن ئەوەشی بە درۆی ئێوە گومڕابی هەر شایستەی گومڕابوونە نەك هیدایەت ، شێخ الاسلام رحمه الله تعالی لا کتابی درء تعارض العقل والنقل: فەرموویەتی : ئەهلی ئیسلام تێکڕا وتوویانە بەهەشت و دۆزەخ کۆتای نییە وە بەردەوام دەمێننەوە وە بەهەمان شێوە ئەهلی بەهەشت بە بەردەوام لە بەهەشت لەناو نیعمەت ئەبن وە ئەهلی دۆزەخیش لە دۆزەخ سزا ئەدرێن وە ئەمەش کۆتای بۆ نییە . لا حول ولا قوة الا بالله

پێغەمبەر فەرموویەتی صلی الله علیه وسلم : اذا لم تستحی فاصنع ماشئت ، ئەگەر شەرمت نەکرد هەرچیت ویست بیکە .

دەقی عەرەبی : وقد اتفق سلف الأمة وأئمتها وسائر أهل السنة والجماعة على أن من المخلوقات مالا يعدم ولا يفنى بالكلية كالجنة والنار والعرش وغير ذلك. ولم يقل بفناء جميع المخلوقات إلا طائفة من أهل الكلام المبتدعين كالجهم بن صفوان ومن وافقه من المعتزلة ونحوهم وهذا قول باطل يخالف كتاب الله وسنة رسوله صلى الله عليه وسلم وإجماع سلف الأمة وأئمتها.مجموع الفتاوى الجزء ١٨ ص ٣٠٧

فقد قال رحمه الله تعالى في كتابه: درء تعارض العقل والنقل: وقال أهل الإسلام جميعا: ليس للجنة والنار آخر، وإنهما لا تزالان باقيتين، وكذلك أهل الجنة لا يزالون في الجنة يتنعمون، وأهل النار في النار يعذبون، ليس لذلك آخر ...

بڕوانە مجموع الفتاوی (٨/ ٣٠٤)، (١٨/ ٣٠٧) بە پڕ بەڵگەوە شێخ باسی کردوە .

*گومانی پێنجەم : هەڵتەکاندنی گومانی خەواریجەکان لەسەر تەکفیرکردنی شێخی ئیسلام ابن تیمیە رحمە اللە ، خەواریجەکان دەڵێن : ابن تیمیە کافرە چونکە ابن تیمیە وای دا ئەنێت کە جەهمیەکان و ڕافضیەکان موسڵمانن ، لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەك دەنگ بوونە لە تەکفیرکردنیان : ئێمەش پشت بە خوا دەڵێین درۆتان کرد ، شێخ تەکفیری هەردوو جۆرەکە دەکات بە ئیجماع ، بەڵام ئێوە ناتوانن ئەو قسانەی کە واتاکەی ڕوون نییە شەرحی بکەن بەو قسانەی کە ڕوونن و موحکەمن ،چونکە قورئان کە کەلامی اللەیە ئایەتی متشابەی تێدایە جا دەبێ ئایەتە متشابهەکان بە ئایەتە موحکمەکان لێکبدرێتەوە چونکە ئەوەی شوێن متشابە بکەوێ واز لە موحکەم بهێنت ئەوا دڵی نەخۆشە بە دەقی ئایەت ئەی چ جای وتەی زانا کە پارێزارو نییە وەك قورئان کە احتیمال هەیە وتەی خۆی نەبێ بۆی زیادکرابێ کە واتا ئەمە ئەولاترە تۆ واز لەوتەی متشابە بهێنی بە دوای وتەی موحکەم و ڕوون بگەڕێی جا هەر لەم ڕوانگەوە ،

ئایا شیخ وتویەتی تەکفیرکردنی جەهمی و ڕافیزەکان خیلافی تێدایە ؟

شێخ نەیفەرمووە لە لای سەلەف خیلاف هەیە لە تەکفیرکردنیان بەڵکو وتویەتی امام احمد دوو بۆ چونی هەیە لەسەر تەکفیرکردنیان کە ئیمام احمد خۆی فەرموویەتی ـ من سەرەتا تەکفیری جەهمیەکانم نەدەکرد تاکو ئایەتانێکم خوێندەوە لە قورئان پاشان ابن تیمیەش کۆتا بۆ چونی امام احمد بەوە دائەنێت کە تەکفیریانی کردوە بۆیەش اجماع نەقڵ دەکات و دەڵێت ئەمە ئیجماعی لەسەرە ، بەڵام خەوارجی چەواشەکار تەنها ئەو قسەیە دێنن کە شێخ فەرموویەتی احمد دوو وتەی هەیە لەسەریان تەنها ئەوە دەهێننەوە و کۆتایەکەی دەپچڕێنن کە شێخ مەسەلەکە دەکاتە اجماع وە کۆتا وتەی امام احمدیش ئەوەیە کە تەکفیریان ئەکات بۆیە شێخ ئەفەرمووێ ئەمە اجماعە .

شێخ فەرموویەتی رحمه الله لە المجموع الفتاوی ( ١٢/ ٤٨٦ ) جەهمیەکان لە لای زۆربەی سەلەف وەك عبدالله بن مبارك و یوسف بن اسباط و دەستەیەك لە هاوەڵانی امام احمد و جگە لەوانیش وتوویانە جەهمیەکان لە ٧٢ گروپەکەنین کە لە ناو ئومەت جیابوونەتەوە وە ئەم وتەیەش هاتوە لە احمدەوە وە هاتوە لە هەموو پێشەوایانی سوننەت و حەدیث ئەوان دەڵێن هەر کەس بڵێت قورئان مەخلوقە ئەو کەسە کافرە ئەوەشی بلێت خوا نابینرێت لە ئاخیرەت ئەوەش کافرە وە هاوشێوەی ئەم قسانە . ( والجهمية عند كثير من السلف : مثل عبدالله بن المبارك ويوسف بن أسباط وطائفة من أصحاب الإمام أحمد وغيرهم ليسوا من الثنتين والسبعين فرقة التى افترقت عليها الأمة .. وهذا هو المأثورعن أحمد وهو المأثور عن عامة أئمة السنة والحديث أنهم كانوا يقولون : من قال القرآن مخلوق فهو كافر . ومن قال إن الله لا يرى في الآخرة فهو كافر . ونحو ذلك ) .

خوێنەری بەڕێز بینیت شێخ الاسلام چۆن ئیجماعی سەلەفی نەقڵ کرد ئایا ئەمە هیچ ناڕوونیەکی تێدایە ؟ ئایا ئەمە ڕوونترین وتە نییە ؟ ئایا خەوارجەکان هیچ ڕویەکیان هەیە قسە بکەن ؟ جگە لە درۆ و چەواشەکاری خەوارجی جاهل کە لە هیچ ناکۆڵنەوە .

*گومانی شەشەم : خەواریجەکان دەڵێن : ابن تیمیە کافرە چونکە ابن تیمیە وای دا ئەنێت کە ڕافضیەکان موسڵمانن ، لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەك دەنگبوونە لە تەکفیرکردنیان . لە وەڵامدا دەڵێن پشت بەخوا لە لای گەورە و بچووك و دۆست و دوژمن زانراوە ابن تیمیە بەوە ناوبانگی دەرکردوە کە تەکفیری رافیزە دەکات بە گەورە و بچووکیان وە لەسەر ئەوەش ئیجماع نەقڵ دەکات بەڵکو تەکفیری ئەوانەش دەکات کە تەکفیری ڕافیزە ناکەن ، بەڵام خەوارجەکان وەك پیشەی هەمیشەیان ناتوانن هەموو وتەکان کۆبکەنەوە حەکمێکی لێ دەربهێنن بەڵکو دەچن وتەیەکی پچڕاو یان وتەیەکی مانا هەڵگر دەهێنن دەیکەنە بەڵگە بۆ عەقیدە فاسدەکەیان ، خەوارج بەم جۆرە دێتە پێش چاوم لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ فەتواکانی شێخ ولله مثل الاعلى خوا لە قورئان فەرموویەتی : فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ئینجا وای بۆ نوێژکەران .

خەوارجەکان لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ فەتواکان شێخ بەو جۆرەیە نایەن تەواوکەر وتەکەی شێخ دانێن تەنها سەرەتاکەی یان کۆتایەك دێنن کە مەبەستی پیسی خۆیان بپێکن.

جا بابگەرێنەوە بۆ ئایەتەکە خۆ ئەگەر کەسێ نەزان بێ ڕەنگە بلێ ئەوەتا خوا ئەڵێ وای بۆ نوێژکەران بۆیە من ئیتر نوێژناکەم ، بەڵام کاتێ دێی دەکۆڵیتەوە لە ئایەتەکە دەبینیت مەسەلەکە شتێ ترە ئایەتەکە باس جۆرە نوێژکەرانی ئەکات کە جیاوازن لە نوێژ خوێنانی تر مەبەستێ تری هەیە ئایەتەکە کە ئەفەرمووێ : فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ئینجا وای بۆ نوێژ کەران. دەبێ لێبکۆڵینەوە بزان مەبەستی کام نوێژکەرە الله ئەفەرمووێ : ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ . الماعون . ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان .

کە واتا لە دوای لێکۆڵینەوە تێگەشتین لە مەبەستی خوا بەڵام گەر لێ نەکۆڵیتەوە ئەوا ڕەنگە توش کوفر و هەڵە بیت کە واتا بە هەمان شێوە ئەی خوێنەر وریابە خەوارج بە بڕین و پچڕاندن وتە توشی غلوت نەکات بەڵکو وەرە لە مەسەلەکە بکۆڵەوە وتەکان شێخ هەمووی کۆبکەوە تا لە مەبەستی شێخ تێبگەی و بە هەڵە و جەهل تێنەکەوی ، جا ئێستا بابزانین ، ئایا شێخ تەکفیری ڕافیزە ئەکات و اجماعی لەسەر نەقڵ ئەکات ؟

شيخ الإسلام لە الإقناع فەرموویەتی : ( إن من دعا ميتا وإن كان من الخلفاء الراشدين فهو كافر وإن من شك في كفره فهو كافر ) هەر کەسێ هاوار لە مردویەك بکات ئەگەر ئەو مردوە لە خەلیفە راشدینەکانیش بێ ئەوە کافرە ئەوەشی گومانی هەبێ لە کافرکردنی ئەویش کافرە .

بینە کەسی خاوەن گومانیشی تکفیرکرد کە گومانیش بەهۆی جەهلەوە دروست ئەبێ وە شێخ جهل و گومانی نەکردە مانع تکفیرکردنی کەسی وەستاو لە تەکفیر ڕافیزە ئایا بەچی عەقڵی دەکرێ شێخ خۆی ڕافیزەی پێ موسڵمان بووبێت ؟!

شيخ الإسلام ابن تيميه رحمه الله : فەرموویەتی : ئەوەی جوێن بە هاوەڵان بدات یان بەهۆی جوێندانی بە هاوەڵان بگاتە ئەوەی بلێ علی خوایە یان پێغەمبەرە یان جبریل هەڵەی

کردوه له هێنانی پەیامەکە ئەوە گومان نییە له کافربوونی ئەو کەسە بەڵکو گومان نییە له کافربوون ئەوەشی بوەستێ له کافرکردنی .

ببینە شێخ بێ دانانی هیچ مەرجێ تکفیری کرد وە تەکفیر ئەوەشی کرد کە بوەستێ له کافرکردن ڕافیزە (من سب الصحابة أو أحدا منهم أو اقترن بسبه دعوى أن عليا إله أو نبي أو أن جبريل غلط فلا شك في كفر هذا بل لا شك في كفر من توقف في تكفيره. )الصارم المسلول ص ٥٩١ ط — دار الجيل )

شيخ الإسلام بن تيميه فەرمویەتیەوە : ( من دعا علي ابن أبي طالب فقد كفر ومن شك في كفره فقد كفر ) ( الرسالة السنية )

هەر کەس هاوار بکاتە علی کوڕی ابی تاڵب کافربووە ئەوەشی گومانی هەبێ له کافربوونی ئەویش کافرە .

نازانم خەوارج چی قەومێکن بێ ئابڕوو جاهل و گێل و خزمەتکار بۆ کافران زیان بەخش بە ئەهلی ئیسلام .

شيخ الإسلام له الصارم المسلول ئیجماع نەقڵ ئەکات و ئەفەرمووێت : "ومن قذف عائشة رضي الله عنها بما برأها الله منه كفر بلا خلاف" ئەو کەسەی (دایە) عائیشە تۆمەتبار بکات بەو شتەی خوا بەڕائەتی عائیشەی پێ کرد ئەو کەسە کافرە بێ هیچ خیلافێك . ئەی خۆ خەوارجەکان وتیان ابن تیمیە بە خیلافی داناوە !

شيخ الإسلام له الصارم المسلول فەرموویەتی : بەهەمان شێوە ئەوەی لەوان وا بزانێ قورئان نوقصانی تێدایە یان هەندێ ئایەتی شاراوەتەوە یان پێی وابێ تەئویلی باطنی بۆ هەیە کە بەو شێوەیە پەکی کردارە شەرعیەکان بخەن وە ئەوانەش ناونراون بە قرامطە و باطنیەکان وە هەیانە تناسخیەی ( پێ وتراوە ) ئەمانە خیلاف نییە لەتەکفیرکردنیان ( وكذلك من زعم منهم أن القرآن نقص منه آيات وكتمت أو زعم أن له تأويلات باطنة تسقط الأعمال المشروعة ونحو ذلك وهؤلاء يسمون القرامطة والباطنية ومنهم التناسخية وهؤلاء لا خلاف في كفرهم )

بۆیە پشت بە خوا ئەو درۆیەشیان هەڵوەشایەوە کە شێخ الاسلام ڕافیزەی تەکفیرکردوە وە ئیجماعی لەسەر نەقڵ کردوە .

*گومانی حەوتەم : خەواریجەکان خوا ڕوو ڕەشیان بکات دەڵێن ابن تیمیە کافرە چونکە ابن تیمیە پێی وایە بابەتی کافرکردنی کەسێك کە جنێو یان نەفرەت ئەکات لە هاوەڵان ڕا جیایی تیا دایە ، لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەك دەنگ بوونە لەسەر کافری کەسێك کە جنێو و نەفرەت لە یەکێ لە هاوەڵان بەدات : وەڵامی ئەو شوبهەیەش ئەوە دەڵێین ئەمە جەهل و نەزانی خەواریجەکانە کە پێیان وایە تەنها جوێندان و قسەوتن بە هاوەڵێك مرۆڤ کافر دەکات ، چونکە ئەگەر وا بوایە ئەوا لە ناو هاوەڵان هەبووە جوێنیان بە یەکتر داوە لە کاتی بوونی ناکۆکیەکدا و کەسیشیان یەکتریان لەسەری تەکفیرنەکرد یان خەوارجەکان نەك هەر جوێن بەڵکو تەکفیری هاوەڵانیان کرد بەڵکو خوێن هاوەڵانیان ڕژاند کەچی نەمان زانیوە هاوەڵان تەکفیری خەوارجیان کردبێ بەڵکو مامەڵەی موسڵمانیان لەگەڵ دەکردن هەر لە قتال و هەر لە حاڵەتی ئاسایشدا بەڵام تبدیع خەوارجیان کرد وە لە علمایانی سەلەفیش خیلاف هەبووە لە تەکفیرکردنیان .

ابن قدامة لە المغني (٨/ ١٠٦) : فەرموویەتی ( خەوارج کە بە تاوان تەکفیر ئەکەن و تەکفیری عثمان و علی و طەلحە و زوبیر و زۆرێ لە هاوەڵان ئەکەن وە خوێنیان و ماڵیان حەلاڵ ئەکەن وتەی فوقەهایان ئەوەیە کە ئەوانە بوغاتن ( واتا کافرنین ) وە ئەمەش وتەی ابو حنیفە و شافعی و جمهوری و فوقەیان و زۆربەی اهلی حەدیثە .

جا ئەوەش نیشانەی جەهلی خەوارجە کە پێیان وایە بە جوێن دان بە هاوەڵێك مرۆڤ کافر ئەبێت دەشڵێن بە ئیجماع ئەوەش هەڵەیە چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی. سباب المسلم فسوق وقتاله كفر . جوێندان بە موسڵمان فسقە شەڕکردن دژی کوفرە ( کوفری نیعمەت ـ کوفری بچووك ) ببینە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جوێندانی بە کوفری بچووکیش دانەنا بەڵکو بە فسقی ناو برد ( هاوەڵانیش مرۆڤن و موسڵمانن ) وە هەر بۆیەش هاوەڵان یەك دەنگ نەبوون لەسەر تەکفیرکردن خەوارج کە خەوارج تەکفیر ئیمامی عوسمان وعلی یشیان کرد و جوێنیان ئەدا و خوێن و ماڵ هاوەڵانیان حەلاڵ کرد کەچی هاوەڵان

تەکفیریان نەکردن ، بۆیە وتنی ئیجماع لەسەر ئەم باسە هەڵەیە چونکە هاوەڵان ئیجماعیان نەبووە لەسەری بەڵکو جمهوری هاوەڵان لەسەر ئەوەن کە خەوارج موسڵمانە سەرەڕای ئەو هەموو جوێن و تەکفیرانەشیان .

بۆیە شێخ الاسلام لە زیرەکی دا هاتووە وتوویەتی مەسەلەی تەکفیر بە جوێندان بە هاوەڵان خیلافی لەسەرە بەڵام ئەگەر تەکفیری هەموو هاوەڵان بکات و تەنها چەند دانەیەکیان تەکفیر نەکات ئەمەیان شیخ خوێ دەفەرمووێ ئیجماعی لەسەرە کە کافرە ، ئەگەریش دەڵێن وتەی سەلەف هەیە لەسەر تەکفیری رافیزەکان ئێمەش دەڵێین : بەڵێ هەر کەس جوێن بە هاوەڵی بدات پێی ئەوترێ ڕافیزە واتا ڕەفزی هاوەڵێکی کردوە ، بەڵام ئیجماع نییە لەسەر تەکفیری ئەو ڕافیزەیەی یان ئەو خەوارجەی جوێن بە هاوەڵێك یان چەند هاوەڵێ ئەدات یان تەکفیریان ئەکات ئەمە خیلافی لەسەرە وەك ابن قدامە باسی لێکرد و شێخ الاسلام پیکاویەتی چونکە هەمان شت لە سەردەم هاوەڵان هەبووە کەچی هاوەڵان ئیجماعیان لەسەری نەبوو !

بۆیە ڕافیزەیەك کە بەس جوێن ئەدات بە هاوەڵێ یان چەند هاوەڵێك بەڵام هیچ شیرك و کوفرێکی نییە کە ئەم جۆرە ڕافیزەیە ئێستا بونی نییە و نەماوە ئەمەیان شیخ وتوویەتی خیلافی لەسەرە و زانایانی اهل السنە وتەکەی شێخیان قبوڵ کردوە ئیلا خەوارجی جاهلی دەرچوو نەبێت .

شیخ الإسلام لە الصارم المسلول ٥٨٦ :" فەرموویەتی : بەڵام جوێن دان بە هاوەڵان جوێندانێك کە نەگاتە ئەو ڕادەیەی تانە بدات لە دین و عەدالەتی هاوەڵان بەڵکو جوێندانێك کە هاوەڵان بە ترسنۆك و ڕەزیلی و کەم زانستی و کەم زوهدی و ئەو شتانە وەسف بکات ئەوا خاوەن ئەو جوێنە ئەدەب ئەدرێت و تەعزیب ئەدرێت بە توندی بەڵام حوکمی کافری بەسەر نادرێت تەنها لەبەر ئەوە ئا بۆ ئەم حاڵەتەیە کە هەندێ علما وتوویانە کافریان ناکەین ،بەڵام ئەو کەسەی نەفرەت بکات لە هەموو هاوەڵان و ڕقی لە هەموویان بێت ئەمە جێی ناکۆکیە لە نێوان زانایان ( وەك چۆن ناکۆکن لەسەر تەکفیری خەوارج ) ، بەڵام ئەگەر ئەوەی تێپەڕاند وتی هاوەڵان مورتەد بوونەتەوە ئیلا چەند دانەیەکی کەمیان نەبێت کە

ناگەن بە دە کەس و ئەوەندە یان بڵێ هاوەڵان فاسقن هەر هەموویان ئەوا گومان نییە لە کافربوونی ئەو کەسە چونکە قورئانی بە درۆ خستۆتەوە کە قورئان باسیانی کردوە بەوەی کە خوا لێیان ڕازی بووە ، وە علمای تری اهل السنه ئەوەیان لە ابن تیمیەوە نەقڵ کردوە و قبوڵیان کردوە .

العلامة محمد بن عبد اللطيف آل الشيخ لە الدرر السنية ( ٨/ ٤٥٠ ) : فەرموویەتی : بەڵام حوکمی ڕافیزە وەك باسکرا ئەوا شێخی ئیسلام ابن تیمیه رحمه الله فەرموویەتی لە کتێبی شمشێری هەڵکێشراو هەر کەسێ جوێن بدات بە هاوەڵان یان یەکێ لە هاوەڵان وە بەهۆی ئەو جوێنەوە نزیك بێتەوە و بڵێت جبریل هەڵەی کرد لە هێنانی ڕسالەکە بۆ محمد صلى الله عليه وسلم ئەوە گومانی تێدانییە کافرە بەڵکو گومان لە کافری ئەوەش نییە کە بوەستێ لە کافرکردنی وە هەر کەس دایکە عائیشە تۆمەتبار بکات بەوەی خوا بەڕائەتی کرد لەو کارە ئەوا کافربووە خیلافی تیانییە بەڵام ئەوەی کە نەفرەت بکات یان ڕقی لە هاوەڵان بێت ئەوە خیلافی تێدایە ئایا کافر ئەکرێت یان بە فاسق دائەنرێت .

کەواتا ئەوەش بزانن کاتێ ابن تیمیه باسی کرد وتی ڕافیزەی اهل بیدەع مەبەستێ پێی ئەوانەیە کە جوێن بە هاوەڵان ئەدەن وە دایکە عائیشە بە زیناکار نازانن و تکفیری هاوەڵان ناکەن و شیرك بڕیار نادەن ، ئەما ئەوەی جوێن بدات و شیرکی هەیە یان دایکە عائیشە بە زیناکار دەزانێ ئەوە خیلافی تیانییە ئەوەشی کافریان نەکات کافربووە وەك ئەو وەك ڕافیزەکانی ئەمڕۆ کە هەر هەموویان کافرن ئەوەی بە کافریان نەزانێ ئەویش کافرە وەك ئەوان یان تەکفیری هەموو هاوەڵان بکات ئەویش بێ خیلاف کافرە وەك شێخ وتی جا چی خەوارج بێ یان ڕافیزە .

سوپاس بۆ خوا کەسانێ ڕەخنە لە ابن تیمیه دەگرن جاهلن بە دین و بە احکامی تەکفیر و بە خیلافی نێوان زانایانی اهل السنه .

*گومانی هەشتەم : خەواریجەکان لەسەر تەکفیرکردنی ابن تیمیه رحمه الله خەواریجەکان قبحهم الله دەڵێن : ابن تیمیه طعن ئەدات لە هاوەڵان وەك ( علي بن أبي طالب و عوسمان

و عائشة ) الله تعالى لێیان ڕازیبێ : سەرەتا ئەم وتەیە لە ابن حجری ئەشعەری وەرگیراوە کە خەوارجەکان خۆیان تەکفیری ئەکەن .

ابن حجر بەهۆی ڕق بوونی لە ابن تیمیه هەندێ شتی بە ستەمەوە داوەتە پاڵ ابن تیمیه بۆ ناشرینکردنی ابن تیمیه رحمه الله بن حجر ئەڵێت ابن تیمیه وتوویەتی لە بارەی عەلیەوە عەلی کەسێکی سەرنەخراو بووە وە چەندان جار هەوڵی بۆ خیلافەت داوە و پێی نەگەیشتووە بەڵکو جەنگی کردوە بۆ سەرکردایەتی نەك بۆ دینداری وە ئەو سەرکردایەتی خۆشویستووە هەروەك چۆن عوسمان ماڵی خۆشویستووە ال في علي : الدرر الكامنة في المائة الثامنة ، لابن حجر ، مجلس دار المعارف العثمانية ، حيدر آباد، الهند ١٣٩٢هـ-١٩٧٢م ج١ ص١٨١ .

ئێمە هەموو زاناکانمان تەحدای ئەو قسەیەی ابن حجر و ئەو خەواریجانەش ئەکەین لە کتێبی ابن تیمیه یەك وتەی وا دەربهێنن من تەحدا ناکەم من هیچ نیم بەڵکو زاناکانی من تەحدای ابن حجر و ئەو خەوارج و ڕافیزانە ئەکەن کە ئەم وتەیەی ابن حجر ئەدەنە پاڵ ابن تیمیه با بێنن بیسەلمێنن ابن تیمیه لە کام رسالە و کتێب وای وتووە ؟ بێگومان ناتوانن بیسەلمێنن تەنها قسەکەی ابن حجری دوژمن ابن تیمیه یان کردۆتە بەڵگە لەسەر ابن تیمیه پاشان من ئێستا وتەی ابن تیمیەتان بۆ دێنم بیخوێننەوە بۆ ڕوو ڕەشکردنی خەوارج و ڕافیزەکان ، ئەو وتەیەی ابن حجر وتی هەمووی ناڕاستە شێخ الاسلام رحمه الله فەرموویەتی لە منهاج السنه ص٣٨٣-٣٨٤ " لە بارەی ناکۆکی نێوان ئیمام معاویە و ئیمام علی فەرموویەتی : علی باشتربووە و بەڕێزترە لە معاویە بە پلەیەك وە علی شایستەترە لە معاویە بە هەق بە یەك دەنگی خەڵك وە سەربازگەی معاویە ئەیانزانی علی لەو باشترە و هەقترە وە کەس ئینکاری ئەمە ناکات ئیلا کەسێکی عیناد یان کەسێ هەوا و ئارەزوو دڵی کوێر کردبێت (( وعلي أفضل منه، وأعلى درجة، وهو أولى بالحق منه باتفاق الناس، وعسكر معاوية يعلمون أن عليا أفضل منه وأحق بالأمر، ولا ينكر ذلك منهم إلا معند أو من أعمى الهوى قلبه )) .

جا ببینن ابن تیمیه چۆن وەسف ئیمام علی ئەکات خەوارجیش چی درۆیەکیان دایە پاڵ ! پاشان دەفەرمووێ ( وكان في عسكر معاوية من يتهم علي بأشياء من الظلم وهو بري منها ).

له ناو سەربازگەی معاویە کەسانێ هەبوون علیان تۆمەتبار ئەکرد بە شتانێ عەلی یش لێی بەریء بوو ٠

سەیری ئەو دیفاعە بکەن شیخ لە ئیمام علی ئەکات : سلیمان الخراشي کتێبێکی داناوە بە ناوی ( ابن تیمیة لم یکن ناصبیا ) هەمووتەکان ابن تیمیەی نقڵکردووە تێیدا یەکێ لە ووتانەی ابن تیمیە عەڕشی خەوارج هەڵ ئەتەکێنێت و ڕسوایان ئەکات ابن تیمیە رحمە الله فەرموویەتی : ئەوانەی دوژمنایەتی عەلی و دۆستەکانی علیان دامەزراند و ئەوانەی کوشتنی علیان حەڵاڵ کرد و تەکفیریان کرد وە یەکێ لەسەر گەورەکانیان علی کوشت " عبدالرحمن بن ملجم المرادي " ئا ئەوانە نەواصبن خەوارجن دەرچوون جا ئەگەر وتیان علی و عثمان و ئەوانەی لەگەڵیان بوونە کافربوونە موڕتەد بوونە ئەوا لە بەڵگەی موسڵمانان لەسەر ( خەوارج و ناصبیەکان ) ئەوەیە بە تەواتری ئیمان هاوەڵان چەسپاوە وە ئیمانیان جێگیربووە بە کتاب و بەسوننەتی سەحیح کە خوا مەدحیان ئەکات و وەسفیان ئەکات وە لێیان ڕازی بووە وە هەواڵی داوە ئەوان اهلی بەهەشتن وە هاوشێوەیَ ئەو دەقانە ... جا ئەگەر ناصبیەك بە ڕافیزەیەك بلێت عەلی کافربوە یان فاسق و ستەمکاربووە وە بۆ سەرکردایەتی جەنگاوە نەك بۆ دین وە اهل دینی کوشتوە لە ئومەتی محمد صلی الله علیه وسلم لە جەمەل و لە صەفین و حروراء هەزارانی کوشتوە لە موسڵمانان لە دوای مردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یەك کافری نەکوشتوە وە فەتح شارێکی نەکردوە بەڵکو اهل قیبلەی کوشتوە هاوشێوەی ئەم قسانە بکات کە ناصبیەکان ڕق هەڵگرەکان دەیکەن جا کەس نییە بتوانێ ڕەدی ئەو ناصبیانە بداتەوە ئیلا اهل السنە و جەماعە نەبێت کە سابقین و یەکەمینەکانیان هەموو خۆشەوێت و لایەنگریان ئەکەن و ئەڵێن : ابوبکر و عمر و عثمان و تەڵحە و زوبیر و هاوشێوەکانیان ئێمانیان وە هیجرەت و جیهادیان جێگیربووە بە تەواتر وە لە قورئان الله وەسفیان ئەکات وە لێیان ڕازی بووە وە لە فەرمووده سەحیحەکان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وەسفکردنیان چەسپاوە بە تایبەت و بە گشتی وەك فەرموودەی لە بارەی عثمانەوە کە صلی الله علیه وسلم لە بارەی عوثمانەوە فەرمووی : ( ألا أستحي مـمن نستحي منه الملائكة ئایا شەرم لە کەسێ نەکەم کە فریشتە شەرمی لێ ئەکا ) وە وەك فەرموودەکەی لە بارەی عەلیەوە کە فەرمووی " لأعطين الراية رجلا يحب الله ورسوله ، ويحبه الله ورسوله ، يفتح الله علي يديه" ئاڵا کە

ئەدەمە پیاوێك كە الله و رسولەكەی خۆشەوێت الله و رسولەكەشی ئەویان خۆشەوێت خوا لەسەر دەستی ( قەڵاكە ) فەتح ئەكات ، وە فەرموودەی ( لكل نبي حواريون ، وحواريي الزبير ) بۆ هەموو پێغەمبەرێ حەواری هەیە حەواری من زوبیرە هاوشێوەی ئەم فەرموودانە بەڵام ڕافیزە ناتوانن بەڵگە بسەپێنن بەسەر ئەو كەسانەی ڕقیان لە عەلیە لە ناصبیەكان هەروەك چۆن اهل السنه دەتوانن ( بەو حەدیثانە دەمكوت ناصبیەكا بكەن ) وە اهل سنه هەموو هاوەڵانیان خۆشەوێ .

جا ببینن شیخ چۆن ڕەد ناصبیەكان ئەداتەوە كە چی ابن حجر چونكەقین لە دڵ بووە بەرامبەر دەعوەكەی شێخ هاتووە ئەو قسانە ئەكات تا خەڵك عقیدە لە ابن تیمیە وەرنەگرن و خەڵك هەر بە اشعری بمێننەوە . خەوارجەكانیش درۆ نەقڵ ئەكەن بێ لێكوڵینەوە .

شێخ الاسلام لە بارەی كوشتنی حسێن فەرموویەتی : وأما من قتل " الحسين " أو أعان على قتله ، أو رضي بذلك فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين ، ابن تیمیە لم یكن ناصبیە لسلیمان الخراشی ئەوەی حوسێنی كوشت یان یارمەتی داوە لە كوشتنی نەفرەت الله و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لێ بێت .

*گومانی نۆیەم : هەڵوەشاندنەوەی گومانی خەواریجە گومڕاكان لەسەر تەكفیركردنی شیخی ئیسلام ابن تیمیە دەڵێن : ابن تیمیە كافرە چونكە ابن تیمیە پێی وایە كە عائشە الله لێی ڕازیبێ نەزان بووە بەوەی كە الله تعالى ئاگادارە بە هەموو ئەو شتانەی مرۆڤەكان دەیشارنەوە ، بەم شێوەیش ابن تیمیە عوزر بە نەزانی بۆ كەسێك دێنێتەوە كە لە مەسەلەی اسماء وسفات دا جاهل بێت لە كاتێكدا پێشینە چاكەكان عوزریان بۆ كەس نەهێناوەتەوە كە جاهل بێ بە سیفەتێ لە سیفەتەكانی خوا .

وەڵامەكەی ئێمەش بەم شێوەیە خەواریجەكان چونكە جاهلن بە مەنهەج سەلەف هەر شتێ بڵێن یەكسەر دەڵین سەلەف یەك دەنگ بوونە لەسەر ئەو شتە ئەو قسەیەش دەكەن بە جەهلەوە نەك بە علمەوە ، بۆیە سەلەف یەك دەنگ نەبوونە كە هەر كەس جاهل بێ بە سیفەتێكی خوا یەكسەر كافر بێت ، چونكە مەسەلەی اسماء وصفات هەندێكی عوزری تێدا قبوڵە وەك مەسەلەی ڕبوبیەت و ئەنجامدانی شیرك نییە كە عوزری تێدا قبوڵ نییە ، بۆیە

ابن تیمیه رحمه الله که فەرموویەتی عائیشه پرسیاری له پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و وتی خەڵکی هەر شتێ بشارنەوه خوا پێی دەزانێت پێغەمبەریش فەرمووی بەڵی شێخ الاسلام دەفەرمووێ عائیشه نەیزانی وەك که خوا به هەموو شتێ ئەزانێ جا ئەم بابەتانه مرۆڤ تێیدا کافر نابێت پێش ئیقامه حجه .

جا شێخ ڕاستی فەرمووه وه قسەی سەلەفی کردوه قسەی خۆی نییه

یەکەم شێخ ناڵی عائیشه به تەواوی جاهل بووه به سیفەتی علمی خوا به گشتی بەڵام دەڵی عائیشه نەیزانیوه خوا به هەموو شتێ ئەزانێ که بشارێتەوه واتا عائیشه زانیویەتی خوا زانایه بەوەی ڕووئەدات و بەوەی دەوترێت و بەوەی ئەکرێت بەڵام تەنها بۆ شته شاراوەکان نەیزانی و پرسیاری له پێغەمبەر کرد و تاکو فێربێت ئەمەش لەناو هاوەڵانیشدا هەبووه .

بۆ نموونه : عبد الله بن أحمد گێڕاویەتیەوه به سەندێکی سەحیح فەرموویەتی موسڵمانان وتیان يَا رَسُولَ اللهِّ ئایا خوا لێمانەوه نزیکه به دەنگی نزم داوای لێ بکەین یان لێمانەوه دووره به دەنگی بەرزەوه هاواری لێ بکەین خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند ، ( وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ) (البقرة: ١٨٦)جا ببینن پێغەمبەر تەکفیریانی نەکرد وه عبداللەی کوڕی امام احمد فەرموهوی موسڵمانان ئەو پرسیارەیان کرد واتا نەیان زانی خوا نزیکه لێیانەوه جا ئەو نەزانیه نەبووه عەیب بۆ هاوەڵان وه پرسیارەکەی دایه عائیشەش که جۆرێ له نەزانین بوونی پێوه دیاره نابێته عەیبه بۆی بۆیه فەرق نییه له نێوان نەزانین بەوەی خوا نزیکه لێیانەوه لەگەڵ علمی خوا به شته شاراوەکان ، بەڵام خەوارج بۆ گومڕاکردنی خەڵك چونکه خۆیان جاهلن دەیانەوێ به جەهلەوه خەڵك گومڕا بکەن .

به نسبەت بڕگەی دووەم دەڵین : ابن تیمیه ئەوه دەکاته بەڵگه بۆ عوزر دانان بۆ ئەو کەسەی جاهل بێ به سیفەتێکی خوا ، ئێمەش دەڵێین : زانایانی سەلەف و زانایانی ئیسلام فەرموویانه جاهل بوون به سیفەتێك یان ناوێك له ناوەکان خوا خاوەنەکەی پێی کافر نابێت ئەمەش بانگەشەی خەوارجەکان به تاڵ ئەکاتەوه که وتیان سلف یەك دەنگن عوزر له مەسەلەی سیفات نییه بەیەك وتەی ئیمامی شافعی ئیجماعەکەیان وەك کەفی سەر ئاو

هەڵئەوەشێتەوە . الإمام الشافعي ( رحمه الله ) : فەرموویەتی خوا ناو و سیفاتی هەیە کە بۆ کەس ڕەوا نییە ڕەدی بکاتەوە وە هەر کەس پیچەوانەی ئەوە بکات دوای جێگیربوونی بەڵگە لەسەری ئەوا کافر دەبێت بەڵام پێش ئیقامە حوجە عوزری بۆ دەهێنرێتەوە بە نەزانی چونکە زانست بوون ( بە سیفەتی خوا ) عەقڵ نازانرێت وە بە فکر و بینین هەستی پێ ناکرێت سیفەتەکان جێگیر ئەکەین وە تەشبیەی ناکەین هەروك چۆن الله لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴿الشورى: ١١﴾ تشبیەکردنی نەفی کردوە .

ئایا شافعی سەلەف نییە ؟ ئایا شافعیش تەکفیر دەکەن کە عوزر دا ئەنێت بۆ مەسەلەی جاهل بوون سیفاتەکانی خوا ؟

الحافظ ابن عبد البر ( رحمه الله ) : فەرموویەتی : زاناکان وتوویانە هەر کەسێ نەزان بێ بە سیفەتێ لە سیفەتەکانێ خوا وە باوەڕی بە هەموو سیفەتەکانی تر هەبێت و بیزانیت ئەوا بە هۆی نەزان بوونی بە هەندێ سیفات کافر نابێت بەڵکو ئەوە کافر دەبێت کە عینادی هەق بکات نەك ئەو کەسەی کە نەزانە وە ئەمەش وتەی زانایانی پێشینە وە ئەوانەشی کە شوێنیان کەوتوون لەوانەی لە دوای ئەوان هاتوون . التمهيد ١٨/ ٤٢

ئەم وتەیەی ابن عبدالبر رێك سەد لە سەد مخالف ئیجماعی خەواریجەکانە کە وتیان سلف ئیجماعیان هەیە کە جەهل لە مەسەلەی سیفاتدا عوزر نییە ، ئەوەندە بەسە بۆ دەمکوت کردنی جاهلیەکان ئەوەشمان لێ تێك نەچێ ئێمە باس لە جاهل بوون بە سیفەتێك نەك هەمووی وە نەك جاهل بوون بە ربوبیەت و لەوەی عیبادەت بۆ غیری خوا ئەنجام بدرێت چونکە شیرك دانان بۆ خوا هیچ عوزرێکی تێدا نییە و هیچ زانایەکیش عوزری بۆ دانە ناوە وتەکان بە عەرەبی : قال عبد الله بن أحمد في السنة ٥٢٢ - حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ أَبُو مَعْمَرٍ، نا سُفْيَانُ، عَنْ أَبِي قَالَ: قَالَ الْمُسْلِمُونَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقَرِيبٌ رَبُّنَا فَنُنَاجِيهِ أَمْ بَعِيدٌ فَنُنَادِيهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ [وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ] (البقرة: ١٨٦) وهذا إسناد صحيح لوالد سفيان والخبر أورده عبد الله بن أحمد في كتاب عقيدة دون أدنى حرج

قال الإمام الشافعي –رحمه الله-: (لله أسماء وصفات لا يسع أحدا ردها، ومن خالف بعد ثبوت الحجة عليه، فقط كفر. وأما قبل قيام الحجة، فإنه يعذر بالجهل؛ لأن علم ذلك لا يدرك بالعقل ولا الرؤية ولا الفكر، فنثبت هذه الصفات وننفي عنه التشبيه، كما نفى عن نفسه فقال: لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ﴿الشورى: ١١﴾) (١) . فتح الباري ١٣/ ٤٠٧

قال الحافظ ابن عبد البر – رحمه الله -: ( قالوا: ومن جهل صفة من صفات الله عز وجل وآمن بسائر صفاته وعرفها، لم يكن بجهل بعض صفات الله كافرا ، قالوا: وإنما الكافر من عاند الحق لا من جهله. وهذا قول المتقدمين من العلماء ومن سلك سبيلهم من المتأخرين ) التمهيد ١٨/ ٤٢

*گومانی دەیەم : خەواریجەکان غەزەبی خوایان لێ بێت دەڵێن : ابن تيميه پێی وایە جیاوازی هەیە لە تەکفیرکردن یان نەکردنی کەسێك کە نوێژ نەکات و بڕوای پێ هەیە ، لە کاتێکدا پێشینە چاکەکان یەك دەنگ بوونە لەسەر تەکفیرکردنی نوێژ نەکەر جا بڕوای پێ هەبێ یان نا :

ئێمەش سەرەتا دەڵێین سێ جۆر نۆێژ نەکەر هەیە :

یەکەم : کەسێ نوێژ ناکات و باوەڕێ پێی نییە ئەمە تەنانەت موڕجیئەانیش بە کافری دەزانن .

دووەم : کەسێ نوێژ ناکات بە هیچ جۆرێك ئەمەش بە ئیجماع سەلەف کافرە شیخ الاسلام خۆی ئیجماع لەسەر ئەوە نەقڵ دەکات .

سێ یەم : کەسێ نوێژ ناکات تا لەکاتەکەی خۆی دەرئەچێت ئەمەش خیلافی لەسەرە لەناو سەلەفدا ابن تيميەش کەوتوویەتی خیلافی لەسەرە مەبەستی ئەمە بووە وە لەوەشدا هەقی پێکاوە نەك کوفری کردبێ وەك خەوارج دەیلێن .

بەڵگەش وتەی شێخە ، شيخ الإسلام لە ﴿المجموع ٢٢/ ٤٨-٤٩﴾: فەرموویەتی ( ومتى امتنع الرجل من الصلاة حتى يقتل لم يكن في الباطن مقرا بوجوبها ولا ملتزما بفعلها : وهذا كافر باتفاق المسلمين ) هەر کات پیاو پابەند نەبوو بە کردنی نوێژ تا ئەکوژرێت ئەوا لە

ناخەوە باوەڕی بە واجب بوونی نەبووە وە پابەندیش نەبووە بە ئەنجامدانی نوێژ ئەو کەسە کافرە بە ئیجماعی موسڵمانان .

ببینە شێخ نەیفەرموو دەکوژرێ وەك موسڵمانێکی تاوانبار وە نەیفەرموو خیلاف هەیە ئایا بە مورتەدی دەکوژرێ یان وەك فاسق وە نەشی فەرموو بە ئیجماع هاوەڵان بەڵکو فەرمووی بە ئیجماع هەموو موسڵمانان کەواتا لێرەدا ڕووی ڕەشی خەوارج دیسان بە دەرکەوت

وە شێخ خۆی ڕوونکردنەوەی داوە لەسەر ئەوەی کە خیلافی لەسەرە وە ڕوونی کردۆتەوە مانای جەحدی واجبکردنی نوێژ لەلای سەلەف مەبەستیان پێی ئەوە نییە کە خەڵکی ئێستا لێی گەیشتوون ، فەرموویەتی ئەوەی زانایان خیلافیان لەسەر هەبووە بۆ کەسێك بووە دان بە واجب بوون بنێت وە پابەندیش بێت بە کردنی نوێژ بەڵام نەیکات ( هەندێ کات ) بەڵام ئەوەی دان بە واجب بوون نەنێت کافرە بەڵام بەو شێوە نییە کە تێگەشتوون لە وشەی جەحدکردن کە هەندێ لە فوقەهایانی احمد و غیری ئەویش بە کاریان هێناوە کەوتوویانە ئەگەر جەحدی واجب بوونی بکات کافرە بەڵام ئەگەر جەحدی واجب بوونی نەکات ئەوا خیلافی لەسەرە بەڵکو لێرە دا سێ بەش هەیە :

یەکەمیان ئەوەیە جەحدی واجب بوونی بکات ئەمە کافرە بە ئیجماع

دووەمیان جەحدی واجب بوونی ناکات بەڵکو پابەند نابێت بە کردنی نوێژ ئەمەش کافرە بە ئیجماع ... چونکە ابلیس کاتێ فەرمانی پێکرا بە سوجدە بەڵام نەیبرد جەحدی واجب بوونی ئەمرەکەی خوای نەکرد چونکە خوا بە ڕاستەوخۆ فەرمانی پێکرد بەڵکو ابلیس خۆی بە گەورە زانی و سوجدەی نەبرد و بووە یەکێ لە کافران ... جا پێویستە لە مەتێبگەی ئەوەی لە زانایان فەرموویانە پێی کافر نابێت ئیلا مەگەر جەحدی بکات ئەوا جەحدی واجب کردن لە لای ئەو زانایە بە مانای بە درۆخستنەوەی ( دەقەکانی واجب بوون دێت ) وە بە مانای بە دان پێنان و پابەندن نەبوونیش دێت . هەروەك قال تعالی : ( فإنهم لا یکذبونك ولکن الظالمین بآیات الله یجحدون ) وقال تعالی : ( وجحدوا بها واستیقنتها أنفسهم ظلما وعلوا فانظر کیف کان عاقبة المفسدین ) جا هەر کات دانی پێ نەنا و پابەندی نەبوو بە کردنی نوێژ ئەوا دەکوژرێت و کافرە بە ئیجماع ، واتا دان نەنان بە واجب بوون لەگەڵ

پابەند نەبوون بە کردنی نوێژ ئەمە هیچ خیلافی تیانییی کە کافرە وە ئەو پابەند نەبوونە خۆی لە خۆیدا جەحدکردنی نوێژە وەك شێخ ڕوونیکردەوە بەڵام ئەوەی خیلافی تیایە ئەوەیە کابرا پابەندە بە نوێژکردن بەڵام هەندێ کات هەندێ فەرز ناکات بە ئەنقەست تالەکاتی خۆی دەرئەچیت .

بۆیە شێخ خۆی دەفەرمووێت : سێهەم ئەوەیە کەدان دەنێت بە واجب بوونی وە پابەندیشە بە کردنی بەڵام نایکات بەهۆی تەمبەڵی یان مەشغوڵ بوونی بە هەندێ شتی خۆی ئا ئەمەیە خیلافی لەسەرە ئەمەش وەك ئەو کەسە وایە کە قەرزارە دان دەنێت بەوەی قەرزارە وە پابەندیشە بە دانەوەیَ قەرزەکە بەڵام دواى ئەخات بەهۆی ڕەزیلیەوە . مجموع الفتاوى ٢٠_٥٨

لە نموونەکەی شێخ لە مەبەستەکەی تێگەشتین کە ئەو و کەسە نوێژ ئەکات بەڵام هەندێ کات نوێژەکان دوائەخات ئەمەیان خیلافی لەسەرە وە شێخ ڕاست ئەکات ئەمە خیلافی لەسەرە بەڵگەش وتەی سەلەفە .

ئیمامی شافعی لە کتابی الام فەرموویەتی : ( لو أن رجلا ترك الصلاة حتى يخرج وقتها كان قد تعرض شرا إلا أن يعفو الله ) ئەگەر پیاوێك واز لە نوێژ بهێنێت تا کاتی نوێژەکە تەواو دەبێت ئەوا توشی شەڕێك بووە ئیلا مەگەر الله لێی خۆش بێت .

وە لە مختصر المزني، ص (٥٣) هاتووە شافعی فەرموویەتی : قال الإمام الشافعي رحمه الله: "يقال لمن ترك الصلاة حتى يخرج وقتها بلا عذر.. فإن صليت وإلا استتبناك، فإن تبت وإلا قتلناك.

بەو ئەو کەسە دەوترێت کە نوێژ ناکات تا لە کاتەکەی دەردەچێت بەبێ عوزر پێی ئەوترێ نوێژ ئەکەی گەرنا داوای تەوبەت لێ ئەکەرێ گەر تەوبە نەکەی دەتکوژین .

ببینە نەیفەرموو تکفیری دەکەین وە لە فەتواکەی تر وتی لە ژێر ڕەحمی خوادایە کە واتا مەسەلەی تەرك کردنی هەندێ نوێژ و نەکردنی لە کاتی خۆی خیلافی تێدایە شێخ ڕاستی

فەرمووە . بەڵام ئەوەی بە ڕەهای نوێژ ناكات كافرە بە اجماعی هاوەڵان و تابعین و اهل السنە و موسڵمانان .

لە تعظیم قدر الصلاة دا هاتووە بە ژمارە ٩٩٩ اسحاق رحمە اللە فەرموویەتی : هەندێ لە زانایان فەرموویانە ئەگەر پیاو وازی لە نوێژ هێنا بە ئەنقەست تا كاتی نوێژەكە تەواو دەبێت ئەوا پێی كافر نابیت . قال إسحاق : ولقد قال قوم من أهل العلم : إذا ترك الرجل الصلاة متعمدا حتى يذهب وقتها لم يكن كافرا . كە واتا خەوارجەكان ڕووی ڕاستان دەرخەن تكفیری ئەو زانایانەی سەلەفیش بكەن یانیش چیتر ڕق و كینەكەتان مەڕژێنن بەسەر براكەم شێخ الاسلام دا رحمە اللە .

*گومانی یازدەهەمی :خەواریجەكان دەڵێن : ابن تیمیە كافرە چونكە ابن تیمیە پێی وایە كە ( الدروز و النصيرية ) كە دوو فرقەی كافرن و هەر نەهاتوونەتە نێو ئیسلامەوە هەڵگەڕاوەن ! بەمەش بیدعەی هەڵگەڕانەوە بە ویراثەی دانا ، كە چەسپاندنی موسڵمانێتی كافرێكە لە ڕابردوودا لە كاتێكدا هەر داخلی ئیسلام نەبووە : ( مجموع الفتاوی ١٦٢\٣٥ )

وەڵام : لەو وتەیەی خەوارج دەگەینە ئامانج كە خەوارج چەندە جاهلن بە دین .

یەكەم : كە ئەگەر ئەو وتەیەی شێخ بیدعەش بێت ئایا هەموو بیدعەیەك خاوەنەكەی كافر دەكات ؟ خەوارجەكانی سەردەم هاوەڵان خاوەن بیدعە بوون بۆ هاوەڵان تەكفیریانیان نەكرد ؟ مورجیئەی فوقەها خاوەن بیدعەبوون لە پێناسەی ئیمان سەلەف بۆ تەكفیریان نەكردن ؟

ئیمامی شافعی و مالك پێچەوانەی ئیجماعی هاوەڵانیان كرد و تائیفەی ممتنعەیان بە مورتەد دا نەناوە ئیلا جاحدەكانیان نەبێت ئایا ئەوانیش بیدعەیان كرد و كافربوون ؟ پاشان ئایا ابن تیمیە كە دەڵێت نوصەیریەكان و دروز مورتەدن پێچەوانەی كام سەلەفی كردوە ؟ بەڵگە بێنن كە بیدعەی كردوە ؟ بەڵگە بێنن .

پێش ابن تیمیە كێ بە نەوەی ڕافیزەی وتووە كافری ئەصلی مەگەر ڕافیزەی جوێندەر لە سەردەمی سەلەف نەبوون ؟ ئەی بۆ لەو سێ سەدەیە ڕافیزەكان نەوەیان نەبوو ؟ وتەی سەلەف بهێنن كە بە نەوەكانی ڕافیزەیان وتووە كافری ئەصلی یان كوا بە ئیجماع سەلەف كافری ئەسڵین ؟

بە پێچەوانەشەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموويەتی : ( مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلا يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، وَيُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ )متفق عليه ( هەر منداڵێك كە لە دايك دەبێت لەسەر فيترەت لە دايك ئەبێت باوكی دەيكەن بە يەهودی يان نەصرانی يان مەجوسی )

واتا لەو فەرمووده دەگەينە ئەوەی منداڵ حوكمی دايك و باوكی وەردەگرێت نەك حوكمێكی جياوازتر جا گەر دايك و باوكی كافری ئەصلی بن ئەوا منداڵەكانيان و نەوەكانيش كافری ئەسڵين .

جا ئەگەر دايك و باوك مورتەدبن منداڵەكەش پێش باڵغ بوون بێت هەمان حوكمی دايك و باوكی مورتەديان هەيە لە احكامی دونيادا بەڵام ئەگەر باڵغ بوون و پابەندی ئيسلام بوون ئەوا موسڵمانن گەر هەر لەسەر رێدەكەی دايك و باوكيان بەردەوام بوون ئەوا بە حوكمی مورتەدبوونی خۆی و حوكمی دايك و باوكی مورتەده لە احكامی دونيا و قيامەت جا دەڵێن چۆن پێی دەڵێن مورتەد لە كاتێكدا كابرا چاوی هەڵهێناوە لە ناو شيرك گەورە بووە ؟

ئێمەش دەڵێن ئيسلامی حوكمی جياوازە لە ئيسلامی هەقيقی هەر كەس بۆ گاڵتەش شايەتومان بهێنت ئەوا لە ڕووكەشدا بە موسڵمان دائەنرێ بەڵام كە كارێكی كرد ئەو شەهادەيە هەڵوەشێتەوە ئەوا پێی دەوترێ مورتەد .

بەڵگەش لەسەر ئەمە مامەڵەی پێغەمبەر و هاوەڵانە لەگەڵ مونافيقەكان كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چاك دەيزانی ئەو مونافيقانە بە درۆوە شايەتومانيان هێناوە و باوەڕيان پێی نييە بەڵام دەبينی پێغەمبەر مامەڵەی ئەو ڕووكەشەی لەگەڵ كرد هەر كەسێكيان كوفرێكی لێ دەركەوتيا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مامەڵەی مورتەدی لەگەڵ دەكرد ئايا پێغەمبەر ئيسلامەتی بۆ مونافيقان دەچەسپاند كە مامەڵەی مورتەدی لەگەڵ مونافيقێكدا بكردايە كە كوفری لێ دەركەوتايە ؟

ئايا پێغەمبەر ئيسلامەتی بۆ مونافيقان جێگيركرد كە ئەوانەی لێيان بمردايە لە گۆڕستانی موسڵمانان دەيناشتن و مامەڵەی موسڵمانانی لەگەڵيان دەكرد لە ئەحكامی دونيادا بۆيە و گۆڕستانێك نەبوو تايبەت بە مونافقان بێت .

که واتا ئیسلامی حوکمی جیاوازه له ئیسلامی هەقیقی ئیسلامی حوکمی وەك وتمان کابرا به شهادەیەك که دەهێنت مامەڵەی موسڵمانی بۆ دەکرێ که کوفرێکی ئەنجامدا به مورتەد ناو ئەبرێت جا که دەلێن مورتەدە ناڵێین پێشتر موسڵمانێکی هەقیقی بووە و به علم و یقین و اخلاص شهادەی هێناوە بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە به هێنانی شهادە و کار نەکردنی بەو شەهادیە و هەڵوەشاندنەوەی مورتەد بۆتەوە .

جا ئیمامی شافعی رحمه الله جوانی فەرمووە کەوتوویەتی خوا لەسەر پێغەمبەرەکەی فەرزی کردوە بجەنگێت دژی بت پەرستان تا موسڵمان دەبن بەوەش خوێنیان پارێزراو دەبێت ئەگەر ئیسلامەتی دەربخەن وە چاك بزانە کەسیش نازانێ ئەوان ڕاستگۆن له موسڵمان بوونیان یان نا ئیلا الله نەبێت پاشان الله به پێغەمبەرەکەی قەومێکی ناساندوە که ئیسلامەتی دەردەخەن و کوفر له ناخیان دەشارنەوە جا ئەوە نەبووە هۆی ئەوەی که پێغەمبەر حوکمیان بەسەر بدات به پێچەوانەی حوکمی ئیسلام وە بۆی نەبوو لەدونیادا سزایان بدات بەپێچەوانەی ئەوەی که دەریانخستەوە ) إعلام الموقعين (٣/ ١١٢) . دەقی عەرەبی له خوارترە .

جا ببینە که ئیسلامی حوکمی جیایە له ئیسلام هەقیقی هەر کەس له کافران یان نەوەی مورتەدان شهادە بێنت حوکمی ئیسلامی حوکمی هەیە له دونیا جا گەر شهادەکەی هەڵنەوەشاندەوە به کوفر ئەوا موسڵمانە له احکامی دونیا و خواش ئاگادارە ئایا به ڕاستی بۆتە موسڵمان یا بەنیفاق وە ئەگەر له دوای شهادە کوفری کرد ئەوا مورتەدە شێخ الاسلامیش پێکاویەتی که به نوسەیریەکانی وتووە مورتەد ، بۆیە دەبێ چاك بزانین ئیسلامی زاهیر شتێکە و ئیسلامی هەقیقی شتێکی ترە ، بۆیە هەر کەس شهادەی هێنا به موسڵمان حسێبە تا ئەو کاتەی کوفری لێ ئەبینرێت دوای کوفرەکەش به مورتەد دائەنرێت ، جا ئیسلامی زاهیر بریتییە له وتنی شهادە جا گەر پێچەوانەی نەکات به ڕووکەش موسڵمانە .

ابو جعفر الطحاوي له بارەی ئەهلی قیبله وتوویەتی : ( ولا نشهد عليهم بكفر ولا نفاق ، ما لم يظهر منهم شيء من ذلك ، ونذر سرائرهم إلى الله تعالى ) شایەتی لەسەر اهل قیبله نادەین به کوفر و نیفاق مادام شتێ لەوانەی لێ به دەر نەکەوێت ( له کوفر و نیفاق ) وە نهێنیەکانیان ( باوەڕی دڵیان ) ئەوە بۆ خوایە .

شارح الطحاوية : فەرموویەتی : ( لأنا قد أمرنا بالحكم بالظاهر، ونهينا عن الظن واتباع ما ليس لنا به علم ) چونكە ئێمە فەرمانمان پێكراوە لەسەر حوكمدان بە ڕووكەش نەهیمان لێكراوە لە حوكمدان بە گومان و شوێن كەوتنی شتێ كە ئێمە زانستمان پێ نییە لە سەری . بەڵكو نەك سەلەف بە ڕافیزەیان نەوتە كافری ئەسڵی ئەم بابەتەی كە نەوەی موڕتەد بە كافری ئەصلی بزانیت لە سەلەف نەهاتووە بەڵكو وتەی زاناكانی دواترە .

شێخ عبداللطيف ال شێخ لە باسی ئەوەی ئایا نەوەی ئەم قبوریانە لە ڕافیزە و سۆفیەكان كافری ئەسڵین یان موڕتەد فەرموویەتی : (ولم يجعلوه كافرا أصليا وما رأيت ذلك لأحد سوى محمد بن إسماعيل في رسالته تجريد التوحيد المسمى بتطهير الاعتقاد ) مصباح الظلام ٢٢ كەس بە كافری ئەسڵی دایانی نە ناون وە كەسیشم نەبینیوە بە كافری ئەسڵی دایان بنێت جگە لە محمد بن اسماعیل لە رسالەكەیدا بە ناوی تجريد التوحيد المسمى بتطهير الاعتقاد.

محمد بن اسماعیل یش لەساڵی ١٠٩٩هـ / لەدایكبووە كە دەكاتە ساڵی ١٦٨٧ میلادی وە لە ساڵی ١١٨٢هـ / مردووە كە دەكاتە ساڵی ١٧٦٨میلادی جا ئایا ئەمە بۆتە سەلەف ؟؟ لای خەوارج یان هەموو شتێ پێچەوانە بۆتە وە لای خەوارج ؟ پاشان كێشە كە لەوە نییە ڕافیزە كافر ئەسڵین یان موڕتەد ئەمە زۆر ئاساییە تۆ ڕافیزە بە كافر ئەسڵی بزانیت بەڵكو كێشە كە لەوەیە خەوارجەكان لەسەر پێچەوانە كردنی ئەو بۆ چونە هەڵەیە تەكفیرت دەكەن كە ئەو بۆ چوونە تازەیە پێچەوانەی سوننەت و وتەكانی پێشەوایانی دینە چ جای تۆ لەسەر اجتهادێكی زانایانی متاخرین كە بە كافریانیش دەزانن بەڵام لەسەر بۆ چونەكەیان دەچن لەو اجتهادەیان لەسەر ئەو اجتهادەش زانایەكی گەورەی وەك ابن تیمیە بە مبتدع دابنەیت و تكفیریشی بكەی ! كە علمت نەبوو عەقڵیشت نەبوو ئەوا ماڵ وێرانەیە نسال الله العافیه

وتەكەی شافعی بە عەرەبی : ( ففرض على نبيه أن يقاتل أهل الأوثان، حتى يسلموا فتحقن دماؤهم إذا أظهروا الإسلام، وأعلم أنه لا يعلم صدقهم بالإسلام إلا الله، ثم أطلع الله رسوله على قوم يظهرون الإسلام ويسرون غيره فلم يجعل له أن يحكم عليهم بخلاف حكم الإسلام، ولم يجعل له أن يقضي عليهم في الدنيا بخلاف ما أظهروا ) إعلام الموقعين (٣/ ١١٢).

*گومانی دوانزەیەم : دەڵین : ابن تیمیه پێی وایه ئەوەی دەرچووه له حاکمێ حوکم بغیر ماانزل الله بکات ئەوانه خەوارجن ، سەرچاوە : منهاج السنة ١٣١\٥

پشت به خوا دەڵێین ئێستا دەرکەوت ئێوە هەر به ڕاستی خەوارجن چونکه ئەوانەی لەو سەردەمانه خروجیان له حاکم وخەلیفەکان دەکرد بێگومان خەوارج بوون چونکه ئەو کات خەوارج دەیوت ئەم حاکمانه گەر تاوانێ بکەن حوکم یان به قورئان نەکردوه بۆیه دەبێ خروجیان لێ بکەین جا من دەپرسم ئایا حاکمەکان سەردەم ابن تیمیه حوکمیان بغیر ماانزل الله دەکرد و دەیانکرده دەستور و فەرزیان ئەکرده سەر خەڵك ؟ یان تەنها جار جار له مەسەلەیەکدا مخالەفەی حوکمی خوایان ئەکرد دواتر ئەگەڕانەوە حوکمەکەی خوایان جێ بەجێ ئەکرد ؟ بێگومان بەڵی حاکمەکانی ئەو کات وەك ئێستا نەبوون حوکم کردنیان به غیر ماانزل الله نەکردبوو به دەستور و یاسا با هەر شێخ خۆێ وەڵاممان بداتەوە لەو سەرچاوەیەی که ئێوە داتناوە بۆ چەواشەکاری بزانین شێخ چی فەرمووە .

شێخ فەرموویەتی : ( وقال تعالى : فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما [ سورة النساء ٦٥ ] شێخ له تەفسیری ئایەتەکه ئەفەرمووێ هەر کەس پابەند نەبێت به حاکم کردنی الله و رسولەکەی ئەوا خوا سوێندی خواردوە به نەفسی خۆی که ئەو کەسه ئیماندارنییه بەڵام ئەو کەسەی پابەندە به حوکمی خوا له ڕووکەش و له ناخیشەوە بەڵام سەر پێچی بکات و شوێن ئارەزووی خۆی بکەوێ ئەوا له ڕیزی هاوشێوەکانی خۆیەتی له تاوانباران وە ئەم ئایەته خەواریجەکان دەیکەنه بەڵگه بۆ تەکفیرکردنی ئەو کاربەدەستانەی که حوکم ناکەن بماانزل الله .

ئێستا با بپرسین ئایا له سەردەمی ابن تیمیه ئەو حاکمانه چۆن حوکمیان بماانزل الله نەکردوە ئایا له قەزیەیەك حوکمیان پێی نەکردوە یان له تشریعی عامدا ؟

لەهەمان شوێن شێخ الاسلام ابن تيمية فەرموویەتی ك ( فەرمانه هاوبەشەکانی نێوان ئومەت له غیری کتاب و سنه حوکمی تێدا ناکرێت بۆ هیچ کەسێك نییه خەڵکی پا بەند بکات به وتەی زانایەك و هیچ ئەمیرێك و هیچ شێخێك و هیچ پاشایەك وە هەر کەس پێی وابێت

حوکم دەکات لە نێوان خەڵکی بە ( وتەی یەکێ لەوانە ) وە حوکمیان لە نێوان ناکات بە کتاب و بە سونەت ئەوا کافرە وە حاکمی موسڵمانان حوکم لە شتە جیاریکراوەکان ( قەزیەیەکی تایبەت ) ئەکەن حوکم ناکەن لە فەرمانی گشتی جا ئەگەر لە دیاریکراوەکاندا ( لە قەزیەیەکی تایبەت بە کەسێك ) حوکمیان کرد پێویستە لەسەریان حوکم بکەن بماانزل الله ) .

لێرەوە دەردەکەوێ شێخ حکم کردن بە غیری ماانزل الله دابەش ئەکات پێی وایە

پابەندکردنی خەڵك بە یاسایەك واتا تشریعی عام ( یاسایەك بۆ گشت خەڵك دابڕێژێت ) شێخ فەرمووی خاوەن ئەو کارە کافرە کە ئەمە حاکمەکانی ئەمڕۆ دەگرێتەوە بەم شێوە ڕووی ڕەشی خەوارج بە دەرکەوت کە واتا بە قسەی ئەو خەوارجانە بێت ابن تیمیە خۆشی بە خەوارج داناوە چونکە تکفیری حاکمێ دەکات حکم بغیر ماانزل الله بکات لە تشریعی عامدا وە شێخ ئەوەی ڕونکردەوە حاکمی موسڵمانان بەس لە قەزیەدا بۆی هەیە حوکم بکات ئەویش دەبێ حوکم بماانزل الله بکات جا ئەگەر لەو قەزیەیە حوکمی بماانزل الله نەکرد ئەوا لای اهل سونە پێی کافر نابێت بەڵکو خەوارجەکانن ئەو ئایەتانە دەکەنە بەڵگە بۆ تەکفیرکردنی ئەو حاکمانە هەر وەك چۆن دەیانوت ئیمام علی کافرە چونکە حوکمی نەکردوە بماانزل الله !

وە شێخ ڕوونیکردەوە و فەرمووی : حاکم بۆی نییە لە فەرمانی گشتیدا حوکمێ دەر بکات چونکە فەرمان کردن و نەهی کردن بۆ تێکڕای خەڵکی مافی تایبەتی خوایە ئەوەی خۆی هاوبەش بکات لەگەل خوا لە فەرمانی گشتیدا کافرە وەك شێخ فەرمووی گەر لە فەرمانی گشتیدا خەڵك بە وتەی شێخی یان پاشایەك پابەند بکات کافرە .

پاشان ببینە شێخ وەسفی حاکمی موسڵمانانی کرد کە ئەوان حوکم لە قەزیەیەکدا ئەکەن نەك لە تشریع دانان بۆیە لێرەوە گەشتینە ئەوەی کە لە سەردەم شێخ حاکمەکان حوکمیان بە غیری ماانزل الله لە دانانی یاسا نەبووە بەڵکو لە قەزیەیەکدا حوکمیان پێی نەکردووە کەچی خەوارج تکفیریانیان کردوە بەو ئایەتانە .

جا سەیرکەن شێخ الاسلام حوکم نەکردن لای دوو جۆرە :

جۆرێکیان پێی کافر نابێ ئەویش ئەوەیە لە قەزیەیەکدا حوکمی پێ نەکات بەڵام ئەمە لای خەوارج پێی کافرە .

جۆرێ تر ئەوەیە حوکم نەکات بە شەرع و حوکم بغیر ماانزل الله فەرزکاتە سەر خەڵک و بیکاتە یاسا ئەمە پێی کافر ئەبێت .

فەرمون ببینن شێخ فەرموویەتی رحمه الله : خوا بەڵێنی سەرکەوتنی داوە بەوانەی کە خوا سەر ئەخەن وە ئەوانەی کتابی الله و دینەکەی و پێغەمبەرەکەی سەر ئەخەن صلی الله علیه وسلم وە سەرکەوتن بۆ کەسێ نییە حکم بغیری ماانزل الله بکات وە قسە لەسەر شتێ بکات کە زانستی پێی نەبێت ، جا ئەگەر سەرکردە دینداربوو بەڵام حوکم بکات بە بێ زانست ئەوا ئەهلی دۆزەخە ، ئەگەر زانابوو بەڵام حوکمی کرد بە پێچەوانەی ئەو هەقەی کە دەیزانێت ئەوە ئەهلی دۆزەخە ، وە ئەگەر حوکمی کرد بە نا عەدالەت و بە بێ زانست ئەوە ئەولاترە ببێتە ئەهلی ئاگر ئەمەش بۆ کەسێکە کە حکم دەکات بە غیری شەرع ( لە قەزیەیەکدا بۆ کەسێکی دیاری کراو ، بەڵام ئەگەر حوکمی کرد بە حوکمێکی گشتی لە دینی موسڵمانانندا هەق بکاتە باتڵ و باتڵ بکاتە هەق سوننەت بکاتە بیدعە و بیدعە بکاتە سوننەت چاکە بکات بە خراپە و خراپەش بکاتە چاکە وە نەهی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم ئەمەیان جۆرێکی ترە کە خوای جیهانیان خۆی حوکمی تێدا ئەکات خوای پێغەمبەران پاشای ڕۆژی قیامەت

( وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ) وە ئەو خوایە کە هیچ پەرستراوی تر نییە جگە لەو هەموو سوپاس تەنها بۆ خوا لە دنیا و لە ڕۆژی دواییشدا وە بڕیار و حوکم هەر بۆ ئەوە و هەمووتان تەنها بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا . القصص ٧٠

﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴾ ٢٨الفتح  خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەرەکەی ناردووە بە ڕێنموونی و ئایینی ڕاستەوە تا بەسەر هەموو ڕێبازێکدا زاڵی بکات تەنها خوا بەسە بە شایەت لەسەر ئەمە .

ببینن شێخ حوکم کردن بە غیری ماانزل الله لە تەشریعی عامدا بە سیفەتی تایبەتی خوای وەسفکرد کە ئەگەر هەر کەسێ فەرمانێ دەربکات بیکاتە یاسایەك بۆ گشت خەڵکی وڵاتەکەی ئەوا تایبەت مەندیەکی خوای بۆ خۆی بردوە ، بەڵام حوکم نەکردن بە غیری ماانزل الله لە قەزیەیەکدا بۆ شەخسێك ئەگەر چی کوفرە بەڵام تایبەت مەندی خوای بۆ خۆی نەبردوە بەڵکو تەنها مەعسیەتی لە فەرمانەکەی خوا کردوە .

بۆ نموونە : ئەگەر حاکمێک لە قەزیەیەکدا نەهی لە شەخسێك بکات بۆ جێ بەجێ نەکردنی ئەمرێکی خوایی بڵێ ئەم حەدە لەسەر فلاَن کەس جێ بەجێ مەکە ئەوا ئەهلی ئاگرە و تاوانبارە ، بەڵام ئەگەر نەهی کردنەکە بکاتە یاسایەکی گشتی ئەوا خۆی کردۆتە شەریکی خوا و تایبەت مەندی خوای بۆ خۆی بردوە . گەر کەسێ ڕێگە بدات بە هەر تاوانێك وە ئەو ڕێگە پێدانەش بکاتە یاسایەکی گشتی ئەوە استحلال تاوانی کردوە چونکە خۆی شوبهاندوە بە خوا لە دانانی یاسادا هاتووە بە پێچەوانەی خوا یاسا دائەنێت بۆ خەڵکی .

بۆیە ئێستا دەرکەوت ئەم خەواریجانە هاوسۆزن لەگەڵ خەوارجە کۆنەکان پێیان خۆشە کە خەوارجەکۆنەکان خروجیان لە خەلیفە و حاکمە موسڵمانەکان کردوە بە بیانوی ئەوەی حوکمیان بما انزل الله نەکردوە لە قەزیەیەکدا ، بێ ئاگان لەوەی حوکم بغیر ماانزل الله لای اهل سوننە دوو جۆرە اکبر و اصغر .

اهل سوننە پێیان وایە گەر حاکم لە قەزیەیەکدا حوکم نەکات بە شەرع ئەگەر بە حەلالی نەزانی کافرنییە ، بەڵام ئەگەر حوکم بغیر ماانزل الله بکاتە یاسایەك و فەرزی بکاتە سەر خەلك ئەو لااهل سوننە ئەم جۆرەیان کافرە وە ابن تیمیە دەیان فەتوای هەیە لەسەر تەکفیرکردنی ئەم جۆرە و فەرموویەتی .

وە فەرموویەتی رحمە الله : واجب دانان و قەدەغەکردن بۆ کەس نییە ئیلا الله و رسولەکەی نەبێ صلی الله علیە وسلم جا هەر کەسێ سزا بدات لەسەرکارێ یان نەکردنی کارێ بەبێ

فەرمانی خوا و پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وە ئەو سزایەش دابڕێژێت و بیکاتە بەرنامەیەك ئەوا بۆ خوا شەریکی داناوە وە بۆ پێغەمبەرەکەی هاوشێوەی داناوە وە لە ڕیزی ئەو موشریکانەیە کە بۆ خوا شەریکیان دانا وە لە ڕیزی ئەو مورتەدانەیە کە باوەڕیان بە موسەیلەمەی کەذاب هێنا وە لەوانەیە کە خوا لە بارەیانەوە فەرموویەتی ( أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله ) . مجموعة فتاوى ابن تيمية، جـ٥، ص١٤

کەواتا هەر کەس مافی یاسادانان و قەدەغەکردن و ڕێگە پێدان و واجب دانان بداتە دەست کەسانی کە بەبێ امری خوا یاسا دابنێن ئەو کەسانە موشریك و مورتەدن .

وەفەرموویەتی : مرۆڤ هەر کاتێ حەرامێکی حەڵاڵ کرد کە بە ئیجماع ئەو شتە حەرام بوو یان حەڵاڵێکی حەرام کرد بە ئیجماع ئەو شتە حەڵاڵ بوو یان یاسایەکی شەرعی گۆڕی ئەوا کافرە مورتەدە بە تێکڕای زانایان . مجموع الفتاوى، جـ٣ صـ٢٦٧.

وە فەرموویەتی رحمه الله : شەرعی دابەزێنراو لەلایەن الله تعالى وە بریتییە لە کتاب و سوننەت کە خوا پێغەمبەرەکەی خۆی پێی ڕەوا نەکرد وە ئەم شەرعە بۆ کەس نییە لە مخلوقات لێی دەربچی وە کەسیش لێی دەرناچێ ئیلا کافر نەبێت . مجموع الفتاوى جـ١١، صـ٢٦٢.

واتا هەر کەس دەرچوو لە شەرع بۆ شەرعیکی تر ئیلا کافرە با پڕ بە دەمیش بلێ ئیماندارم کە واتا لێرەوە دەرکەوت خەوارجەکانی ئێستا وەك خەوارجە کۆنەکانن هەموو حوکم نەکردنی بە کوفر اکبر دەزانن ئەگەر چی لە یەك قەزیەشدابێت ، دەرکەوت خەوارجەکانی ئێستا درێژە پێدەری خەوارجەکانی پێشون چونکە پێیان جائیزبووە خروج لەسەر خەلیفە و حاکمە موسڵمانەکانی ئەو کات ، بەڵام سوپاس بۆ خوا اهل سنه لە مەسەلەی حکم بغير ماانزل الله مام ناوەندن لە نێوان بەناو سەلەفیە مەدخەلیەکان و خەوارجەکان ، وەك خەوارج نین بلێین ئەگەر لە قەزیەیکیش حوکم نەکات کافرە ، وە وەك مەدخەلیەکانیش نین بلێین ئەگەر دەستوور بخاتە شوێن شەرع و دین لە دەوڵەت لا بدات هەر موسڵمانە سوپاس بۆ خوا دوورین لەو دوو گروپە گومڕاییە .

*گومانی سیانزەیەم : خەواریج دەڵێن : ابن تیمیە کافرە چونکە قسمێکی تری داهێناوە بۆ ناساندنی وڵاتەکان لە کاتێکدا سەلەف وتوویانە وڵات یان وڵاتی کوفرە یان وڵاتی ئیسلامە کەچی ابن تیمیە دەڵێ قسمی سێهەمیش هەیە کە وڵاتی تێکەڵەیە بۆیە بەو قسەیەی کافربووە ! مجموع الفتاوی ٢٨\٢٤١ و المسائل الماردينية

ئێمەش دەڵێین یاسبحان اللە جەهل چی بە خاوەنەکەی دەکات غلو و خاوەنەکەی بەرە و کوێ دەبات لە ئیسلامدا اصل و فەرع هەیە اصل ئەو شتانەیە کە هەڵەکردن تێیدا هیچ عوزرێك نییە بۆ خاوەنەکەی تێیدا بەڵام لە فەرع ئەگەر خاوەنەکەی هەڵە بکات عوزری بۆ هەیە بەڵکو پاداشتی چاکەشی بۆ هەیە نەك تەکفیر ، جا با بزانین پێناسەی وڵاتەکان لە ئیسلامدا لە ئەصلی دینە یان لە فروعی دینە

ئەصلی دین : بریتیە لەوەی کە بە عەقڵیش ئەو شتە دەسەلمێنرێت وەك ناسینی خوا و خواپەرستی .

بەڵام ناسینەوەی وڵات پێویستی بە بەڵگەیە و بە عەقڵ ناسەلمێنرێ کە واتا بەو شێوەیە ناسینی وڵات لە ئەصلی دین نییە بەڵکو لە فقهـ و فروعەکانە وە هیچ دەقێکی سەڕیح نەهاتووە کە ناسینی وڵات بکاتە ئەصلیك و مخالفی پێ تەکفیر بکات وە زانایانیش تێکڕا نەبوونە لەسەر وەسفی ناسینی وڵاتەکان بەڵکو خیلافیان هەبووە و لەسەریەك وتە کۆك نەبوونە و هیچ اجماعێکیش لە سەلەفەوە نە چەسپاوە کە واتا جارێ ئەسڵەن ناسینی دارکوفر و دارئیسلام فقهیە و ئەسڵی دین نییە وە کە فقهیشە خیلافی لەسەرە ئیتر بە چی هەقێك تەکفیری ابن تیمیە دەکرێ لە بابەتێکی خیلافی اجتهادی فقەی ؟ ئەی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم چی فەرمووە لەسەر زانا ئەگەر نەیپێکا و هەڵە بکات لە فروع ئایا پێغەمبەر تەکفیری دەکات یان فەرموویەتی ئەگەر نەشی پێکا پاداشتێکی هەر بۆ هەیە ؟ بەڵگەش وتەی خۆشەویستە صلی اللە علیە وسلم کە فەرموویەتی : ( إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران ، وإذا اجتهد فأخطأ فله أجر ) ئەگەر حاکم ( زانا ) اجتهادی کرد ( هەوڵ و تێکۆشانی کرد بۆ دۆزینەوەی هەق ) ئەگەر لەو تێکۆشانەی هەقی پێکا دوو پاداشتی هەیە وە ئەگەر هەڵەی کرد یەك ئەجری بۆ هەیە ". متفق علیە خ (٧٣٥٢) م (١٧١٦) .

ببینە پێغەمبەر فەرمووی ئەگەر نەشی پێکا ئەجرێکی بۆ هەیە کەچی خەوارجی زێدەڕەو قسەکەی پێغەمبەر بەدرۆ ئەخەنەوە و ملکەچی نابن ، جا مەسەلەی ناسینی وڵاتەکان لە اصلی دین نییە و لەمەسەلەی بیدعە نییە تاکو هەڵە لە خاونەکەی قبوڵ نەکرێت و تبدیع یان تەکفیر بکرێت بەڵکو لە مسائلی فروع و احکامە لە مسائل فروع و فقهیشدا بە دەقی فەرموودەکەسی تێکۆشەری هەڵەکار پاداشتێکی بۆ هەیە نەك تبدیع و تفسیق و تکفیر بکرێ

ئیمامی أبو محمد ابن أبي زید القیرواني رحمه الله فەرموویەتی : ( لە وتەی اهل السنه ئەوەیەکە ئەو کەسە عوزری بۆ نییە کە بەهۆی اجتهادەکەیەوە تووشی بیدعە بێت چونکە خەوارج اجتهادیان کرد لە تەئویل کردانداا بەڵام ئەو اجتهادە نەبووە عوزر بۆیان کاتێ بەهۆی اجتهادەوە دەرچوون لەسەر هاوەڵان پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم ناوی لێ نان بە دەرچوان لە دین بەڵکو اجتهاد لە ئەحکامدا ) احکامەکان وەك احکامی ڕۆژوو و زەکات و میراث و ناسینی وڵاتەکان ... هتد ) ئەجری هەیە ئەگەر هەڵە بکات .كتاب الجامع في السنن والآداب والمغازي والتاريخ ص١٢١

جا کەوابوو ئەمە ئەو پەڕی غلوی خەواریجە گومڕاکانمان بۆ دەرئەخات کە لە مسائلی فروع و احکام تەکفیر ئەکەن لە کاتێکدا اهل سنە لە فروعدا تەکفیر ناکەن و خاوەنەکەی بە مجتهد دەزانن ، جا ابن تیمیە رحمه الله بیدعەی نەکردوە چونکە مخالەفەی ئایەت و فەرموودەی سەڕیحی نەکردوە وە مخالەفەی سەلەفی نەکردوە چونکە سەلەف لەسەر پێناسەی وڵاتەکان یەك قسەیان نییە بەڵکو هەر یەکەیان اجتهادێکی هەبووە شێخیش زانایەکە لە زاناکان ئەویش اجتهادی خۆی لەم بابەتە فقهیە کردوە جا ئەگەر نەیپێکابێت پاداشتێکیشی بۆ هەیە چونکە پێچەوانەی هیچ قەطعیاتێکی ئیسلامی نەکردوە وە سەلەفیش لە دەیان مەسەلەی فقهی واحکامدا ڕاجیاوازیان هەبووە کەسیانیش کەسیان تەکفیر نەکردوە والحمدلله رب العالمین کە ئێمە لەو جەهالەتە بەریئین و دوورین لە غلوی اهلی غلو کە خەواریجی کۆن بەسەد جار شۆراونەتەوە لە چاو ئەم جاهیلانانەی فیسبووك .

*گومانی چواردەیەم : خەواریج دەڵێن : ابن تیمیە کافرە چونکە وەسفی ابو حەنیفەی داوەتەوە ابو حەنیفەش بە ئیجماعی سەلەف تکفیر کراوە ! لە وەڵامی ئەو شوبهە پڕ لە نەزانیەی خەواریجەکان دەڵێین : سەرەتا با بزانین ئەم ئیجماعەی سەلەف لە کوێ هاتووە تکفیری ابو حەنیفە کرابێ !

ئەگەر بڵێن لە کتاب سوننەی عبدالله بن امام احمد تکفیر کراوە ئێمەش دەڵێن :

( یەکەم ) : وتەی زانایەك و دوو زانا و سێ زانا بەڵکو دە زانا و بیست زاناش پێی ناوترێ ئیجماع چ جای وتەی زانایەك لە کتێبێکدا کە ئەو وتەیەش ڕە دئەکەینەوە لەبەر دوو هۆ :

یەکەم ـ ئەو وتانەی کە لە کتاب السنەی عبداللەی کوڕی ئیمام احمد هاتووە گوایە تەکفیری ابو حنیفە ئەکات یەکەم لە ڕووی سەنەدەوە زەعیفە .

دووەم ـ ئەگەر سەحیحیش بێت ، ئایا لەبەر چی تەکفیر کراوە ئایا ڕاستە ابو حنیفە کوفری هەبووە وە ئایا ئەو کوفرەی عبدالله تەکفیری ابو حنیفەی لەسەر ئەکات چەسپاوە لەسەر ابو حنیفە ؟ بێگومان نەخێر چونکە ئەمە وتەکەی عبدالله یە کە لەسەر تکفیر ابو حنیفە نەقڵی کردوە ، رحمە الله دەفەرمووێ : ( بیستم لە باوکم رحمە الله وتوویەتی لە بارەی ابوحنیفەوە وتی وا گومان ئەکەم ابو حنیفە دوو جار داوای تەوبەی لێکراوە لەسەر ئەم ئایەتە { سبحان ربك رب العزة عما یصفون } . ابو حنیفەش وتوویەتی ئەمە مخلوقە جا پێیان وت ئەوە کوفرە و داوای تەوبەیان لێی کرد ) .

الدكتور محمد بن سعيد القحطاني ئەڵێت حوكم نابێت بە گومانەوە بدرێت ئیمام احمد ئەفەرموێ وا گومان ئەبم کە واتا وتەکەی بە گومانەوە وتووە پاشان ئیمام احمد خۆی بۆی دەرکەوتوە ابوحنیفە وای نەوتووە .

أبو بكر المروزي دەفەرمووێت ( هەروەك چۆن لە تاريخ بغداد ١٣|٣٧٨) : هاتووە دەڵێت بیستم لە باوکی عبدالله احمدی کوڕی حنبل فەرموویەتی : ( لم يصح عندنا أن أبا حنيفة كان يقول: القرآن مخلوق ) . لامان نەچەسپاوە کە ابو حنیفە وتبێتی قورئان مەخلوقە .

دەی بەو وتەیەی ئیمام احمد هەرچی وتەەی تره نەسخ دەبێتەوە و کاری پێ ناکرێ چونکە ئەو وتانەی کە ئیمامی عبدالله بن احمد بن حنبل نەقڵی ئەکات کە تکفیری ابو حنیفه ئەکات بۆیە تەکفیر ئەکات کە گوایە ابو حنیفه دەڵییت قورئان مەخلوقە بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە تەنها گومان بووە جا کە وانەبووە بۆیە کار بەو حوکمانە ناکرێت چونکە ابوحنیفه شتی وای نەوتووە لێشی نەچسپاوە بۆیە وتەکەی عبدالله بن امام احمد یان هەر زانایەکی تر گەر سەحیحیش بێت ئەوا کاری پێ ناکرێ چونکە ابو حنیفه شتی وای نەوتووە وەك ئیمام احمد فەرمووی وە لەسەر یشی نەچەسپاوە بۆیە ناکرێ ئیمە هەر تکفیری ابوحنیفه بکەین بڵێین مادام وتەی ئەو زانایانە هەیە هەر کافرە لە کاتێکدا کە ابوحنیفه لەو کوفرانە بێ ئاگایە و بەریئە ئێستاش بە کورتی ئەوەتان بۆ دەسەلمینم ان شاء الله

یەکەم ابو حنیفه : نەیوتووە قورئان مەخلوقە بڕوانە ئەم سەرچاوانە کە اثباتی ئەوە دەکات ابو حنیفه وتوویەتی قورئان وتەی خوایە ، ابن عبد البر له التمهيد" (٩/ ٢٤٧) , باسی کردوە ، وە "شارح العقيدة الطحاوية" (ص٣٩٥) باسی کردوە کە ابوحنیفه دەڵێ قورئان وتەی خوایە ، وە كتاب "اعتقاد الأئمة الأربعة" (ص٣-٨) للدكتور محمد بن عبد الرحمن الخميس دەیسەلمێنت کە ابو حنیفه وتوویەتی قورئان وتەی خوایە ، وە شێخ الاسلامیش ئەوە ڕەد ئەکاتەوە کە ابو حنیفه وتبێتی قورئان مەخلوقە بۆیە وەسفی ابو حنیفەی کردوە .

بۆیە شیخ الإسلام رحمه الله : زانایان هەمویان سیفەتەکانی خوا جێگیر دەکەن وە دەڵێن قورئان وتەی خوایە و مەخلوق نییە وە دەڵێن خوا لە ئاخیرەتدا دەبینرێت وە ئەمەش مەزهەبێ هاوەڵان و شوێنکەوتوانیانە بە چاکە لە ال بیت و جگە لەوانیش وە ئەمە مەزهەبی پێشەوایانی شوێنکەوتو بۆ کراوە وەك مالك بن أنس والثوري والليث بن سعد والأوزاعي وأبي حنيفة والشافعي وأحمد بن حنبل وإسحاق ... " "منهاج السنة النبوية" (٢ / ٥٤)

کەواتا سەرەتا سەلماندمان بە کورتی کە ابو حنیفه دەڵێ قورئان وتەی خوایە وە ابن تیمیەش کە وەسفی کردوە بەوە وەسفی دەکات کە ابو حنیفه وەك شافعی و احمد و مالك سیفەتەکانی خوا جێگیر دەکات .

پاشان ئەی خەواریجە نەزانەکان گەر ئێوە تەکفیری شێخ الاسلام ئەکەن کە مەدحی ابو حنیفەی کردوە دەسا پیاوبن تەکفیر پێشەوایانی سەلەفیش بکەن و ڕوو ڕەشی خۆتان بە یەکجاری پیشان خەڵك بدەن .

فەرموو سەلەف چۆن وەسف ابو حنیفە ئەکات :

علي بن عاصم دەڵێت : ئەگەر عیلمی ئەبو حەنیفە بە عیلمی خەڵکی سەردەمی خۆی پێوانە بکرایە ئەوا قورستر دەبوو لێیان .

وە پێشەوا ابن المبارك دەڵێت : ئەبو حەنیفە تێگەیشتوو ترینی خەڵك بوو .

وە ئیمامی شافعی دەڵێت : خەڵك لە تێگەیشتن ( فیقھ ) جێما و ( یان بچووکی ) ئەبو حەنیفەن .

سەرچاوەش : المزي لە تهذیب الکمال باسی کردوە وە الذهبي کتابێکی داناوە بە ناوی مناقب الإمام أبي حنیفة و صاحبیه أبي یوسف و محمد بن الحسن ، وە هەروەها الحافظ محمد بن یوسف الصالحي الشافعي رحمه الله لە کتابی عقود الجمان في مناقب أبي حنیفة النعمان .

جا شێخ الاسلام بۆچی کافر بکرێ کە ئیمام احمد وەسفی ابو حنیفە ئەکات و ڕەحمەتی بۆ ناردوە !

بڕوانە الجواهر المضیة تراجم الحنفیة للشیخ عبد القادر القرشي ج: ١ ص: ٨ (( کە دەیگێڕێتەوە کە ئیمام احمد زۆر باسی ابو حنیفەی کردوە و ڕەحمەتی بۆ ناردوە وە بۆی دەگریا لە سەردەمی میحنەتەکەیدا .

بۆیە تەکفیر ابن تیمیە مەکەن ئەی زۆڵەکانی ڕافیزە و گۆڕپەرستەکان چونکە ابن تیمیەش شوێن شافعی و احمد و ماك کەوتووە لە وەسفکردنی بۆ ابو حنیفە بۆیە ابن تیمیە رحمه الله فەرموویەتی : لە المنهاج (٢|٦١٩) : « هەروەك چۆن کەسانێ پێچەوانەی ابوحنیفە ئەکەن لە شتانێکدا و انکاری لێ ئەکەن بەڵام کەس گومانی نییە لە فقهـ و تێگەیشتن و زانستەکەی

وه شتانێکیان له ابوحنیفەوە گێڕاوەتەوە مەبەستیان ناشرین کردنیەتی وە ئەو شتانەش درۆن به بڕاوەی .

خەواریجەکان دەمتان داخەن چیتر بە هۆی جەهل و نەزانی خۆتانەوە دەم بۆ زاناکان مەبەن گەر زانایەکتان تکفیرکرد لەسەر شتێ فەرموون سەلەفیش لەسەر ئەو شتە تکفیرکەن ان کنتم الصادقین ـ الالعنة الله علی الکاذبین ، وەڵامی ئەم گومانەش ڕوایەوە بەفەزڵی خوا .

*گومانی پانزەیەم : دەڵێن : ابن تیمیه کافره چونکه دەڵێت کردنی مولد النبوی خێره ! به بیدعەی دانه ناوە بەڵکو حەڵاڵی کردوه !

ئێمەش دەڵێن ڕووی نەزانی هەموو کات ڕەشه ، سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین ئێمە وەك اهل سنه به پێچەوانەیَ خەوارج پێمان وایە بیدعە دوو جۆرە :

بیدعەیەك خاوەنەکەی کافر دەکات ئەمەش وەك بیدعەی گۆڕپەرستی و هاوارکردنه پیاو چاکان و بیدعەی تجهم و ڕافیزە ..هتد . بەڵام بیدعەیەکی تر ئەوەیە خاوەنەکەی پێی کافر نابێت بریتییە لە بیدعەی کرداری کە کوفری تیانییە .

بەڵگەشمان لەمە ئەوەیە : کە سێ کەس هاتن بۆ لای دایە عائیشه ڕەزای خوای لێ بیت پرسیاریان لە دایە عائیشە کرد لە بارەی عیبادەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دایە عائیشەش باسی کرد بۆیان کە پێغەمبەری خوا بەو شێوەیە عیبادەت ئەکات جا ئەوانیش وەك بڵێی عیبادەتەکەی پێغەمبەریان پێ کەم بووبێت یەکیان وتی من هەرگیز ژن ناهێنم تاکو لە عیبادەت دوور نەکەومەوە ، دووەمیان وتی من هەموو ڕۆژێ بە ڕۆژوو ئەبم ، سێهەمیان وتی من هەموو شەوێك شەونوێژ ئەکەم ، جا کاتێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەوەی زانی فەرمووە ، ئەوە ئێوە بوون ئاوا و ئاواتان وت ؟

دەسا چاك بزانن من هەندێ شەو شەونوێژ ئەکەم و هەندێ شەویش دەخەوم هەندێ ڕۆژ بە ڕۆژوم و هەندێ ڕۆژیش بە ڕۆژوونیم وە ژنیش دێنم هەر کەس حەز بە سوننەتی من نەکات لە من نییە .

سەرەڕای ئەوەی ئەو سێ موسڵمانە زیادەیان خستبوە سەر عیبادەتکانیان لەسەر سوننەت نەبوون لەو شتەدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تەکفیریانی نەکرد تەنها هەڕەشەی کرد .

که ئەوەی حەز لە سوننەتی ئەو نەکات لە ئەو نییە جا ئایا ئەی خەوارجە گومڕاکان ئەگەر هەموو بیدعەیەك کوفرە بۆ پێغەمبەر ئەوانی تەکفیر نەکرد و نەیانی کوشت و ماڵ و خوێنیانی حەڵاڵ نەکرد ؟؟؟!

که واتا هەموو بیدعەیەك کافرکەرنییە بەڵام هەموو بیدعەیەك گومڕاییە ، پاشان ئایا ابن تیمیە وتوویەتی مولد النبوی جائیزە ؟ با جەهلی خەوارجمان بۆ دەرکەوێ .

ابن تیمیة رحمه الله با بزانین چی وتووە وا خەوارج لێیان گەورەکردوە فەرموویەتی : فتعظيم المولد واتخاذه موسما قد يفعله بعض الناس ويكون له فيه أجر عظيم لحسن قصده وتعيظمه لرسول الله صلى الله عليه وآله وسلم . اقتضاء الصراط المستقيم : ٢٩٧

بە گەورە ڕاگرتنی مولد وە کردنی کە هەندێ لە خەڵکی ئەنجامی ئەدەن کە بۆی پاداشتیکی گەورە هەیە بە هۆی نیەتی پاکیەوە وە بەهۆی بە گەورە ڕاگرتنی بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

دەبینن ابن تەیمیە فەرمووی هەندێك لە خەڵکی مەبەستی ئەو کەسانەیە کە بە دڵێکی پاك و نەزانینەوە ئەو کارەدەکەن جا بە هۆی نیاز پاکیەکەیان و خۆشویستنیان بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پاداشت وەردەگرن چونکە نازانن کارەکەیان بیدعەیە واتا لێرەدا ابن تیمیە عذریان بۆ دێنتەوە بە هۆی نیەت پاکیان ، بەڵام خەوارجی جهال وەك پیشەی هەمیشەیان بێ ئاگان لە فەتوای کۆن و فەتوای تازە بێ ئاگان لە ناسخ و لە منسوخ لە فەتواکان بێ ئاگان لە کۆکردنەوە و جەمعی فتواکان کە ئەوەش بەرهەمێکی خراپی لێ دەبێتەوە چونکە تۆ بە فەتوایەك ستەم لە زانایەك ئەکەی لە کاتێکدا ئەو زانایە لە شوێنی تر پەشیمان بۆتەوە لەو فتوایە یانی پێم سەیرە الله پەشیمانی عبد قبوڵ ئەکات ئەم خەوارجانە پەشیمان قبوڵ ناکەن و هەر حوکم ئەدەن !

شێخی ئیسلام خودی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی مولد النبوی بە بیدعە دەزانێت وەك خۆی فەرموویەتی : ( وَأَمَّا اتِّخَاذُ مَوْسِمٍ غَيْرِ الْمَوَاسِمِ الشَّرْعِيَّةِ كَبَعْضِ لَيَالِي شَهْرِ رَبِيعٍ الْأَوَّلِ الَّتِي يُقَالُ إنَّهَا لَيْلَةُ الْمَوْلِدِ، أَوْ بَعْضُ لَيَالِي رَجَبٍ، أَوْ ثَامِنَ عَشْرَ ذِي الْحِجَّةِ، أَوْ أَوَّلُ جُمُعَةٍ مِنْ رَجَبٍ، أَوْ ثَامِنُ

شَوَّالٍ الَّذِي يُسَمِّيه الْجُهَّالُ " عِيدُ الْأَبْرَارِ "، فَإِنَّهَا مِنْ الْبِدَعِ الَّتِي لَمْ يَسْتَحِبَّهَا السَّلَفُ وَلَمْ يَفْعَلُوهَا وَاَللَّهُ سُبْحَانَهُ، وَتَعَالَى أَعْلَمُ ) . مجموع الفتاوى الكبرى لابن تيمية : ٤ / ٤١٤.

ئاهەنگێران و تایبەتکردنی عیبادات لە هەندێ لە شەوانی مانگی ربيع الاول کە پێی دەڵێن شەوی مەولودە یان هەندێک شەوی مانگی رجب و ١٨ ی ذي الحجة و یەکەم جومعەی سەرەتای مانگی رجب و ٨ی شەوال ئەو نەفامانای کە ناویان ناوە بە جەژنی الابرار گشت ئەمانە لەو بیدعە داهینراوانەن کە سەلەف بە چاکیان نەزانیوە و ئەنجامیان نەداوە .

ببینە شێخ فەرمووی هەموو ئەوانە بیدعەن و پێچەوانەی مەنهەجی سەلەفن کوان خەوارجەکان ؟؟ ئەی ئەمە وتەی شێخ نییە ؟ ئەی ئەمە بۆ ناخوێننەوە ، شێخ ئەو فەتوایەی کە دەڵی بیدعەیە لە مجموع الفتاوى هاتووە کەواتا مەجالی تیانییە چونکە مجموع الفتاوى تحقیق کراوە الحمدلله .

کەواتا ئەم دوو فەتوایەی شێخ لە دوو حاڵەت بەدەر نییە :

یەکەم شێخ بە فەتوای دووەمی پەشیمان بۆتەوە لە فەتوا یەکەمینەی .

دووەم حاڵەتیش یان ئەوەیە شێخ هەر مولدی پێ بیدعەبووە بەڵام عوزری بە نەزانی هێناوەتەوە بۆ ئەوانەی نەزانن و بە دڵی پاکەوە دەیکەن .

جا ئەگەر هەر کام لەو دوو حاڵەتە بێت شێخ لەسەر ئەوە مردوە کە احتیفال مولد النبوی پێ بیدعەبووە ، بۆیە با خەواریج دەمی بۆ گەنیان لە ئاست شێخ دابخەن ڕەحمەت لە شێخی ئیسلام تۆقێنەری خەواریج و مورجیئە و ڕافیزە و سۆفی و ئەشعەریەکان .

*گومانی شانزە و حەڤدە : دەڵێن : ابن تیمیە کافرە چونکە حوکمی کوفر ناداتە سەر ئەو کەسەی کوفرێ بکات ئیلا دوای ئیقامە حوجە نەبێت .

درۆیان کرد بە ناوی ابن تەیمیەوە : مەدخەلیەکان و جماعەتی کرێکار و ئەم خەواریجانە بە ناوی ابن تیمیەوە درۆ ئەکەن کە ئەڵێن : گوایە ابن تیمیە تەکفیر کەسی دیاریکراو ناکات ئیلا دوای ئیقامە حوجە نەبێت !

سەرەتا پێش هێنانی وتەکانی شێخ بابزانین اهلی علیم چۆن ڕەدی ئەو درۆیەیان داوەتەوە کە کاتی خۆی هەمان ئەو بوهتانە دراوتە پاڵ شێخ الاسلامەوە .

شێخ عبداللطیف بن عبدالرحمن بن حسن بن محمد بن عبدالوهاب فەرموویەتی لە ڕەدی هاوشێوەکانی جەهمیەکانی ئەمڕۆ : ( وكيف لا يحكم الشيخان على أحد بالكفر الشرك وقد حكم الله به ورسوله وكافة أهل العلم وهذان الشيخان يحكمان : أن من إرتكب ما يوجب الكفر والردة والشرك يحكم عليه بمقتضى ذلك وبموجب ما إقترف ؛ كفرا أو شركا أوفسقا ، إلا أن يقوم مانع شرعي يمنع من الإطلاق وهذا له صور مخصوصة لا يدخل فيها من عبد صنما أو قبرا أو بشرا لظهور البرهان وقيام الحجة بالرسل )

چۆن هەردوو شێخ ( ابن تيميه و ابن قيم ) حوكم نادەن بە کافربوونی کەسێك لە کاتێکدا خوا و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم حوکمی کوفری بەسەردا داوە وە هەروەها هەموو زانایانیش وە ئەم دوو زانایەش ( ابن تيميه و ابن قيم ) حوکمیان داوەتە سەر ئەو کەسەی کە بکەوێتە ناو کوفر و ڕیدە و شیرکەوە ئەوا بە پێی کارەکەی حوکمیان بەسەردا داوە ئیلا مەگەر ڕێگریەکی شەرعی هەبووبێت لەوەی حوکمی بەسەردا بدەن ئەمەش بۆ چەند حاڵەتێکی تایبەتە ئەوانە ناگرێتەوە کە بتێك دەپەرستێت یان گۆڕێك دەپەرستێت یان ممرۆژێك دەپەرستێت چونکە ئەم شتانە ڕوونن و ئیقامە حوجەشی بە هاتنی پێغەمبەران کراوە . هـ منهاج التأسيس .

ئێستاش با بێنین بزانین ابن تيميه وتوویەتی هەر کەسێ شیرك و کوفری اکبر بکات موسڵمانە ؟! پێویستە ئێمە شارەزای مەزهەبی ابن تيميه بین .

شێخ الاسلام لە تەکفیردا مەزهەبی بەم جۆرەیە : تەکفیری پێش ئیقامە حجە ـ ناوی ئەنێت بە کافری بێ سزادان ، تەکفیری پاش ئیقامە حوجە ـ ئەمە دوو لقی لێ ئەبێتەوە .
١- ئەگەر کوفری کەسەکە لە بابەتە ڕوونەکان بوو وەك سجدە بردن و پاڕانەوە و ... هتد

جا ئەگەر کەسێ ئەو عیبادەتانە بۆ غیری خوا بکات شێخ ناوی ئەنێ بە کافری سزادراو لە پاش ئیقامە حوجە بەڵام پیش ئیقامەش بەکافری دەزانی بەڵام بێ سزادان .

٢- ئەگەر کوفری کەسەکە لە بابەتە شاراوەکان بوو بۆ نموونە کەسێك جاهل بێت بە سیفەتێکی خوا یان ناوێکی بۆ نموونە نەزانێت خوا الرحیمە ئەوا لە پاش ڕوونکردنەوە ناوی کافری بەسەردا ئەنرێت .

کەواتا هەر کات شێخ ووتی تکفیر ناکەین ئیلا دوای ئیقامە حوجە واتا مەبەستی تەکفیری سزادان ناکات ئەگینا شێخ تەکفیر دەکات پێش ئیقامە حوجە و ڕوونکردنەوە ئەگەر کەسەکە کەوتە کوفرێکەوە وە کوفرەکە لە بابەتە ئاشکراکان بێت بۆ نموونە گەر کەسەکە گۆڕپەرست بێت یان شەخص پەرست ئەوا شێخ بە کافری دەزانێت پێش ئیقامە حوجە و ڕوونکردنەوە بۆی بەڵام سزای نادات تا ئیقامە حوجەی نەکات .

بەڵگەش وتەی شێخە رحمە اللە : ناوی کوفر بەسەر ئەو کەسە دەدرێت کە شیرك و کوفر دەکات ئەگەر جاهلیش بێت .

شیخ الاسلام ابن تیمیة لە المجموع (٣٨/٢٠) ئەفەرمویت : (( فاسم المشرك ثبت قبل الرسالة ، فإنه یشرك بربه ویعدل به ویجعل معه آلهة أخری )) ناوی موشریك جێگیربووە ( بەسەر کەسەکە ( لە پێش گەیشتنی پەیام چونکە ئەو کەسە هاوشیوە و هاواتا بۆ خوا بڕیار دەدات

واتا ئەوەی شیرك و کوفری کرد پێی دەوترێ کافر بەڵام نەك کافرێك کە سزا بدرێت چونکە تەکفیری سزادان دوای ئیقامە حوجە دێت .

ئەمەش بەڵگەی وتەی خوای لەسەرە شێخ لەخۆیەوە ئەم قسەیەی نەکردوە ، قال تعالی: ( وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً ) ئێمە سزای هیچ کەسانێ نادەین تا پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە نەکەین .

جا خوا نەیفەرموو ئێمە تەکفیریان ناکەین تا ئیقامە حوجە دەکرێن بەڵکو فەرمووی سزایان نادەین واتا کافرن بەڵام سزا نادرێن تا پەیامبەریان بۆ ڕەوانە نەکات

دووەم تەکفیر بە مەبەستی ئەوەی بە کافرێکی دەزانێت کە سزادانی واجبە

شيخ الاسلام ابن تيمية له المجموع (٢/ ٧٨) : دەفەرموویت : (( والكفر المعذب عليه لا يكون إلا بعد بلوغ الرسالة )) کوفری سزدار و نابێت ئیلا دوای گەیشتنی پەیام .
جا سەرنج بدەن له فەتوای یەکەم وتی ناوی موشریکی لێ دەنێریت له پێش گەیشتنی پەیامی خوایی ، بەڵام بۆ تەکفیری سزادان فەرمووی سزانادرێت ئیلا دوای گەیشتنی حوجەی خوایی بەو کەسە .

دیسان شێخ الاسلام بن تیمیة دەفەرمووێ له مجموع الفتاوی ١٦/ ٢٥٤ : (( والكفر بعد قيام الحجة موجب للعذاب )) کوفر له دوای ئیقامه حوجه سزادان واجیب دەکات . کەواتا ئەمە قاعیدەیه له مەزهەبی شێخ کەوترا تکفیر دوای اقامه حجه دەکرێ واتا تەکفیری سزادانان ئەگینا شێخ پێش ئیقامه حجەش کەسەکه به موسڵمان نازانێ بەس سزادانی واجب ناکات تا بۆی ڕوون ئەکرێتەوه .

نموونەش لەسەر ئەوەی شێخ له بابەته ڕوونەکان کەسەکه تکفیر ئەکات و ئیقامه حوجەش ناکاته مەرجی تکفیر کردن ، شێخ الاسلام ابن تیمیه رحمه الله له مجموع الفتاوی (٤/ ٥٤) فەرموویەتی : ئەوه ئەگەر له بابەته شاراوەکان بێت به خاوەنەکەی ئەوترێ کەسێکی هەڵەکار و گومڕایه و ئیقامه حوجه نەکراوەکه پێی کافر بێت بەڵام هەندێ لەو کۆمەڵانه دەکەوێته ئەو کوفرانەی که ڕوون و ئاشکران که عامەی موسڵمانان و زانایانی دەیزانن که ئەو شته له دینی موسڵمانانه بەڵکو یەهود و گاوریش ئەزانن که محمد خوا ناردویەتی بەو شتانه و تەکفیری ئەوانەشی کردووه که پێچەوانەی دەکەن له فەرمان کردن به یەکخواپەرستی به تاك و بێ هاوبەش دانان بۆی وه نەهی کردوه له پەرستنی غیری خوا وەك پەرستنی فریشته و پێغەمبەران و خۆر و مانگ و ئەستێره و بتەکان و جگه لەوانەش ئا ئەمانه ئاشکراترینی دروشمەکانی ئیسلامه هەر وەکو فەرمان کردنی به پێنج نوێژه فەرزەکه وه به واجب دانانی و به گەوره ڕاگرتنی وه وەك دژایەتی کردنی بۆ یەهود و گاورەکان و موشریکان و صابیئەکان مەجوسەکان وه وەکو حەرامکردنی خراپکاریەکان وەك ڕیبا و ئارەق و قومار و هاوشیوەی ئەمانه ( واتا ئەمانه له باسه خەفیەکان نین هەر کەس نکۆڵی ئەو شتانه بکات کافره پێش ئیقامه حوجه به پێچەوانەی مەسەله خەفیەکان که دوای ئیقامه حجه کافر دەبێت ) .

وە بۆ ئەوەی دەمکوتی خەوارجەکانیش بکەین کە شێخ تکفیری ئەو کەس و کۆمەڵانەی کردوە پێش ئیقامە کە کەوتونەتە ئەم کوفرە ڕونانەوە و عوزری بۆیان دانەناوە لە کتێبی اقتضاء الصراط المستقيم : شێخی ئیسلام فەرموویەتی : ( كما قد يفعله طائفة من منافقي هذه الأمة الذين قد يتقربون إلى الكواكب ، بالذبح والبخور ونحو ذلك ، وإن كان هؤلاء مرتدين لا تباح ذبيحتهم بحال ) هەروەك چۆن هەندێ لە مونافیقەکانی ئەم ئومەتە ئەو کارانە دەکەن خۆیان لە ئەستێرەکان نزیك ئەکەنەوە بە سەربڕین و بخوڕ و هاوشێوەی ئەوشتانە جا ئەوانە ئەگەر چی مورتەدن ئەوا سەربڕاوی دەستیان حەڵاڵ نییە بە هیچ جۆرێ.

ببینە بە کۆمەڵ تەکفیری ئەو کەسانە دەکات و سەربڕاوی دەستیان بە حەرام دا ئەنێت بەبێ ئەوەی چوو بێت ئیقامە حوجەشیان بکات .

ئێستا خەوارجەکان پێمان بڵێن لەم وتانە ڕوونتر هەیە ؟ وە هەتاکو نەشڵێن ئەو وتانە بۆ موتڵەقن ئەوا دەمکوتان دەکەم بە دوو نمونەی تر لە وتەکانی شێخ کە جاهل بوون ناکاتە مانعی تکفیر بەڵکو دەیکاتە مانعی سزادان لە مجموع الفتاوى (٢٧/ ٢٦٩) : فەرموویەتی : ( وَأَمَّا قَبْرُ غَيْرِهِ فَالْمُسَافِرُونَ إلَيْهِ هكُلُّهُمْ جُهَّالٌ ضَالُّونَ مُشْرِكُونَ ) . بەڵام جگە لە قەبرەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ( کە خەڵکی دەچن سڵاوی لێ ئەکەن لە کاتی حەج و عەمرە ) ئیتر ئەوانەی زیارەتی قەبری جگە لەو دەکەن هەر هەموویان جاهیل و گومڕاو موشریکن .

ببینە فەرمووی هەر هەموویان واتا بە تاك و بە کۆ فەرمووی : جاهیلن ، گومڕان ، موشریکن ناویانی نا بە موشریك سەرەڕای وەسف کردنیشی بۆیان کە ئەوانە جاهیلن وە بە جەهلەوە وا ئەکەن کە واتا لێرەوە بە تەواوی ڕوون بوویەوە شێخ جەهل ناکاتە مانعی تەکفیری بێ سزادان بەڵکو جەهلی کردۆتە مانعی تەکفیری سزادان .

وه هەروەها شێخ رحمه الله له مجموع الفتاوى (٧/ ٣٢٦) : فەرموویەتی : ( وَالْجَهْلُ بِاَللَّهِ فِي كُلِّ حَالٍ كُفْرٌ قَبْلَ الْخَبَرِ وَبَعْدَ الْخَبَرِ ) جاهل بوون بەخوا له هەموو حاڵەتێ کوفره پێش هەواڵ پێدان و دوای هەواڵ پێدانیش .

تەسرِیحی دا به کافربوونی ئەوەی جەهلی هەیە لە تەوحید ئەگەر چی پێش ئەوەی بۆشی ڕوون بکەنەوە ئەوا یەکسانە بە دوای ڕوونکردنەوە بۆی وە تەکفیرکردنی دیاریکراوی بۆ ڕازی پێش ئەوەی له لای جێگیر بووبێت كە ڕازی تەوبەی کردوە لە کوفرەکانی .

شێخ فەرموویەتی : هەروەك ئەو کتێبەی کە ڕازی داینابوو لە عیبادەتکردن بۆ ئەستێره و بتەکان وە بەڵگەی هێنابوو لەسەر دورستی و چاکی ئەو کاره وە حەزی پێ بوو وە ئەمەش هەڵگەڕانەوەیە لە دینی ئیسلام بە یەك دەنگی موسڵمانان ئەگەر چی پێدەچێت تەوبەشی لەوە کردبێت و گەڕابێتەوە بۆ ئیسلام . " مجموع الفتاوی " (٤/ ٥٥) .

ببینه شێخ تەکفیری دەکات بە دیاری کراوی و بەوە وەسفی کرد کە لە ئیسلام دەرچووه بەو کارەی ئەگەر چی تەئویل و جەهلیشی هەبوو بێت هیچ لەوانە ناکاتە بەڵگەی موسڵمان بووی ئیلا ئەوە نەبێ کە تەوبەی کردبێ لە کوفرەکانی وە ڕاستیش ئەوەیە ڕازی تەوبەی لەو کوفرانەی کردوە و گەڕاوەتەوە سەر مەنهەجی سەلەف .

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم : ( إنما الأعمال بالخواتيم ) رواه ابن حبان (٣٤٠) ، وصححه الألباني ، کردوەکان بە کۆتاییەکەیانە .

ابن الصلاح : دەڵێت : القطب الطوعاني دوو جار پێی وتم کە گوێی لە فخری ڕازی بووه کەوتوویەتی خۆزگە خۆمم مەشغوڵ نەکردایە بە زانستی کلام و دەگریا "شذرات الذهب " (٧/ ٤١) .

وه ئیمامی ابن كثير رحمه الله له " البداية والنهاية " (١٧/ ١١-١٢) باسی کردوه فەرموویەتی : ڕازی وەسیتی کرد لەسەره مەرگدا کە گەڕاوەتەوە بۆ ڕێبازی سەلەف وە تسلیم بوون بۆ هەموو ئەو دەقانەی هاتوون بەو شێوەیەی کە خوا مەبەستێتی .

ئیمامی ابن القیم رحمه الله فەرموویەتی : أن الرازي " رجع إلى طريقة الوحي والآثار النبوية "ڕازی گەڕاوەتەوە بۆ ڕێگای وەحی و ئاثاری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم
الصواعق المرسلة " (٣/ ١١٦٦) ، " اجتماع الجيوش الإسلامية " (ص ١٩٤) .

الحافظ الذهبي رحمه الله لە الفخر الرازي لەباسی ژیاننامەکەیدا دەڵێت : لە السير (٢١/ ٥٠٠) : العلامة الكبير ذو الفنون فخر الدين محمد بن عمر بن الحسين القرشي البكري الطبرستاني الأصولي المفسر ، هەندێ بەڵای گەورە و نەهامەتی لێ بە دەرکەوت و لادان لە سوننەت و سیحر کردن خوا لێی خۆش بێت ( الحمدلله ) لەسەر ڕێگای ڕاست مرد ( تەوبەی لە کوفرەکانی کرد ) و خواش ئاگادارە بە نهێنیەکانی .

کەواتا لە ڕووکەشدا نابێت حوکمی تکفیر بەسەر ڕازی بدرێ چونکە لەسەر مەرگدا اعلانی کردوە تەسلیم دەبێ بۆ مەنهەج سەلەف بەو شێوەی خوا دەیەوێ ئەمە ڕووکەشی حاڵیەتی

بەڵام کاتی کە کافربووە شێخ الاسلام تکفیری کردوە عوزری بۆی نەهێنابوویەوە ، الحمدلله دەمکوت خەوارج کرا سوپاس بۆ خوا .

کە شێخ تکفیر پێش ئیقامە حجە ئەکات ، کە شێخ تکفیر رازی کردوە لەسەر کوفرەکانی بە دیاری کراوی لەسەر ئەو کوفرەیانەی کە کردبووی وە شێخ ناڵێ جاهل بووە یان تەئویلی هەبووە موسڵمانە و عوزری بۆ ناهێنتەوە ئیلا ئەوە نەبێ کە شێخ دەڵێ گەر تەوبەی کردبێ ئەوا موسڵمانە وە بەڵی تەوبەی کردوە و موسڵمانیشە .

ئیتر نازانم خەوارجەکان بە چی ڕوویەکەوە لە خۆیانەوە دێن تکفیر ئەکەن بە هەوا و ئارەزوو ڕازی گەر تەوبە بکات لە کوفر شێخیش لە تکفیرکردنی پەشیمان بێتەوە بە هۆی تەوبەکەی ڕازیەوە ئایا ئەمە مانای ئەوەیە شێخ عوزرِ بە جەهلی بۆ داناوە یان شێخ لەسەر تەوبەکەی بە موسڵمانی داناوە ئەگینا پێش تەوبەکەی شێخ بە مورتەد ناوی بردوە : ( وهذا إذا كان في المقالات الخفية فقد يقال إنه فيها مخطىء ضال لم تقم عليه الحجة التي يكفر صاحبها لكن ذلك يقع في طوائف منهم في الأمور الظاهرة التي تعلم العامة والخاصة من المسلمين أنها من دين المسلمين بل اليهود والنصارى يعلمون أن محمدا بعث بها وكفر مخالفها مثل أمره

بعبادة الله وحده لا شريك له ونهيه عن عبادة أحد سوى الله من الملائكة والنبيين والشمس والقمر والكواكب والأصنام وغير ذلك فإن هذا أظهر شعائر الإسلام ومثل أمره بالصلوات الخمس وإيجابه لها وتعظيم شأنها ومثل معاداته لليهود والنصارى والمشركين والصابئين والمجوس ومثل تحريم الفواحش والربا والخمر والميسر ونحو ذلك ) .

*گومانی هەژدەیەم : دەڵێن : ابن تیمیه وتوویەتی زەوی خڕە بەمەش پێچەوانەی سەلەفی کردوە بۆیە کافرە !

منیش دەڵێم ئێوە هێندە شوێن کەوتە و دڵسۆزنین بۆ مەنهەجی سەلەف خوا ئاگادارە بەڵام بە حاڵتان دا دیارە گەر ابن تیمیه بیگوتایە زەوی تەختە ئێوە دەتانوت کافرە چونکە ناڵێ خڕە ئێوە لەم قسانەتان تەنها دەتانەوێ زانایەك بشکێنن کە خوا بەرزی کردۆتەوە ، بەڵام پشت بەخوا دەیسەلمێنێن ئایا ابن تیمیه بەو قسەیە کافرە ؟ مبتدعه ؟ گومڕایە ؟ یان وتەی سەلەفی هێناوە ؟ ئایا زانایان اجماعیان هەبووە کە زەوی خڕە یان تەختە ؟ پشت بە خوا دەڵێین : شێخ الاسلام ابن تیمیه وتەی زانای سەلەفی حەنبەلی نەقڵ کردوە کە ئەو وتوویەتی زەوی خڕە جا با خەوارج تکفیری ئەو زانایە بکەن و تەکفیر هەموو زانایانی سەلەفیش بکەن کە ئەو زانایەیان تکفیر نەکردوە گەر وانەکەن ئەوا خەوارجەکان خۆیان کافر دەبن بە عقیدەکەی خۆیان .

شێخ الاسلام فەرموویەتی : الإمام أبو الحسين أحمد بن جعفر بن المنادي کە یەکێکە لە زانا ناودارەکان بە شوێنکەوتەی ئاثار و نوسینی زانستە گەورەکان لە هونەرەکانی زانستە دینەکان وە لە طەبقەی دووەمی هاوەڵانی احمدە ( فەرموویەتی ) هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان زانایان کە ئاسمان لەسەر شێوەی تۆپە ( خڕە ) وە فەرموویەتی زانایان تێکڕا کۆکن کە زەوی بە هەموو جوڵەکانیەوە لە بەحر و لە وشکانی وەك تۆپ وایە وە بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە مانگ و خۆر لەسەر هەموو شوێنەکان سەر زەویَ بەیەك کات ئاوا نابن و هەڵنایەن .

دەسا ئەی خەواریجەکان دەفەرموون دوای تکفیری ابن تیمیە تکفیری ئەم زانایە بکەن و تکفیری زاناکانی سەردەم ابن المنادی بکەن چونکە تکفیر ابن المنادی یان نەکردوە گەر وانەکەن کافر دەبن !

جارێ ئەگەر ئیجماعێك هەبێ ئەوا ئیجماع لەسەر خڕی زەوی هەیە چونکە ابن المنادی کەسێکی شارەزابوو بە ئاثار خاوەن ٤٠٠ کتێب و نوسراوە .

پاشان ئایا ئەم بابەتە ئیجماع تێیدا صەحیحە ؟

بێگومان نەخێر بابەتێکی خیلافیە ئەوانەی وتویانە بە اجماع خڕە تکفیری ئەوانەیان نەکردوە کە دەڵێن تەختە ئەوانەشی وتویانە بە ئیجماعە تەختە نەیان وتوە ئەوەی نەڵێ تەختە کافرە بەڵگەشم بۆ قسەکەم هەر لەوتەی ئەو زانایانەیە کە دەڵێن زەوی خڕە .

الإمام ابن عطية : لە کتابی المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز لەلاپەڕە ١٩٧٣ لە تەفسیری سوڕەتی الغاشية ١٩ فەرموویەتی : ( سطحت ) ڕووکەشی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە زانایان لەسەری بوونە کە زەوی تەختە و خڕ نییە وە ئەمەش اهلی علم لەسەری بوونە وە ئەوەشی بڵێت خڕە ئەگەر چی بەو قسەیەی هیچ ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی شەرع هەڵناوەشێتەوە ئیلا ئەوە نەبێت کە ئەو وتەیە زانایان بە بەڵگەدار و چەسپاوی نازانن!

دەسا ببینن ابن عطیە بە پێچەوانەی ابن المنادی حنبلی دەڵی بە اجماع زەوی تەختە لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ ئەوەی بڵێ خڕە کافر نییە و هیچی لە شەرع هەڵنەوەشاندۆتەوە ! دەسا خەوارجەکان پێمان بڵێن کێ پێشتان کەوتوە لە تەکفیر کردنی ئەو زانایانەی کەوتویانە زەوی خڕە ؟ ئەوەتا ئەو زانایانەی کە دەشڵێن زەوی تەختە تکفیری زاناکانی بەرامبەریان ناکەن ؟ ئێوە کێ سەلەفتانە ؟ ابن ملجمە دڵنیام گەورەی خەواریجەکان ، بۆیە ئەم بابەتە خیلافی یە و ئیجماع تێیدا یەکلا نەبۆتەوە بۆیە کەسی بەرامبەر تکفیر ناکرێت ، لەوانەی ئەم باسەیان بە خیلافی داناوە ، ابن عادلی حنبلی لە کتابی اللباب في علوم الكتاب بەرگی ٢٠ تەفسیری سوڕەتی الغاشية الاية ٢٠ دەڵێ زاناکان دوو ڕەئیان هەبووە هەندێ وتویانە زەوی خڕە و هەندەکیش وتویانە تەختە .

وە هەروەها ڕازی یش دەڵیت خیلافی لەسەرە لە التفسير الكبير و مفاتيح الغيب بەرگی ١٩ لاپەڕە ٣ کەواتا ئەم باسە علما سێ بۆ چونیان هەیە و ئیجماعی تیانییە ، بۆیە مخالەفە کردنی هەر بۆ چونێ نابێتە کوفر اکبر چونکە کاتێ ئیجماعێك مخالەفە کردنی کوفرە کە ئەو ئیجماعە هیچ مخالفێکی نەبێت لە زاناکان بەڵکو جگە لە ابن المنادی و ابن تيميه ابن حزم و ابن كثيريش اجماعيان نەقڵ کردوە کە زەوی خڕە ، بەم شێوەیەش احمقی خەوراج گەشتۆتە لوتکە کە جاهلن بە اجماع و بە خیلافی نێوان زانایان بۆیە هەر کەس هەر بۆ چونێك هەڵدەبژێرێت موسڵمانە و پێ نابێتە اهل بيدەع وە وروژاندنی ئەم بابەتە لە لایەن خەوارجەوە بۆ مەبەستی ڕوخاندنی پێگەی زانایانە ئەگینا ئەوان ئەهلی ئەوە نین قسە لەم باسانە دا بکەن .

دەقی وتەکەی شێخ کە لە ابن المنادی نەقڵی کردوە ، قال الامام ابن المنادى من أعيان العلماء المشهورين بمعرفة الآثار والتصانيف الكبار في فنون العلوم الدينية من الطبقة الثانية من أصحاب أحمد : لا خلاف بين العلماء أن السماء على مثال الكرة...... قال : وكذلك أجمعوا على أن الأرض بجميع حركاتها من البر والبحر مثل الكرة . قال : ويدل عليه أن الشمس والقمر والكواكب لا يوجد طلوعها وغروبها على جميع من في نواحي الأرض في وقت واحد ، "مجموع الفتاوى" (٢٥/ ١٩٥) باختصار .

ئەمەش بەشێکە هەر لەو کتێبە کە خەوارج زاناکانی لەسەر تکفیر کردوە یەکێ لەو زانایانەش ئیمامی ابن خزيمەيە رحمه الله کە خەوارج تکفیری دەکەن بە تۆمەتی جەهمیەت بۆیە ویستم لەگەڵ بە ڕائەتی ابن تیمیه لە کوفر و بیدعە بەڕائەتی ئەو ئیمامەی سەلەفیش بسەلمێنم و ڕەدی ئەو خەواریجە گومڕایانە بدەمەوە .

وەڵامی گومانێکی تری خەواریجەکان لەسەر تەکفیرکرنی زانایانی سەلەف دەڵێن : ابن خزيمە جەهمیە ! و پەکی سیفەتی روخساری خوای خستووە ئێمەش دەڵێین : بەڕائەتی ابن خزيمە لەوەی کە گوایە پەکی سیفەتی ڕوخسار و وێنەی خوای کرد بێت ، بەڕائەتی پێشەوایان و سەلەفی صالح لە عەقیدەیٚ جەهمیەت و نەفی صیفات .

ئایا ڕاستە ابن خزیمە پەکی سیفەتی ( صورة ) وێنەی خوای خستوە وەك زەهەبی دەڵیت ( کتابی ابن خزیمە لە تەوحید مجلدێکی گەورەیە کە لەو کتێبەدا تەئویلی حەدیثی صورەی کردوە ) السیر ( ١٤/ ٣٧٤ )

ئەوە گومانی زەهەبی و هەندێ کەسی ترە کە گومانیان وایە ابن خزیمە رحمە الله وێنەی خوا جێگیر ناکات بۆ خوا بەڵام بەو شێوەیە نییە .

چونکە هەر لەو کتابەی کە زەهەبی ئاماژەی پێدا ابن خزیمە لە باسی چوارەم بابەکەی ناو ناوە بە ( إثبات الوجه لله جل ثناؤه ) بە واتای ( جێگیر کردنی ڕوخسار بۆ الله جل ثناؤە ) ، وە لە باب پێنجەم ناوی ناوە بە ( باب ذکر صورة ربنا جل و علا و صفة و جهه عز وجل ) باب باسکردنی وێنەی الله جل و علا وە سیفەتی ڕوخساری الله عزوجل

جا وێنەی خوای جێگیر کردوە وە لەو باریەشەوە فەرموودەی ڕیوایەت کردوە هەر کتاب التوحید (ح ٢٤٩ ) فەرمودەکەش ئەوەیە کە پێغەمبەر صلى الله علیە وسلم فەرموویەتی :

( فیأتیهم الله في صورته التي یعرفون ) الله دێت بۆ لایان لەسەر ئەو وێنەیەی خۆی کە دەیناسنەوە .

جا ببینە ابن خزیمە سەرەتای باسەکەی بە اثبات کردنی وێنە و ڕوخساری خوا باسکرد و بەڵگەشی لەسەر هێنایەوە ، جا ئایا مەبەستی زەهەبی چی بووە کە دەڵی ابن خزیمە تەئویل حەدیث وێنەی کردوە ؟

ئەو حەدیثەی کە زەهەبی مەبەستیەتی ئەو فەرمودەیەیە کە پێغەمبەر النبي صلى الله علیە وسلم فەرمووی لە بارەی ئەو منداڵەی کە گەورەکەی دای بوو لە ڕووخساری منداڵەکە .

ئەوجا پێغەمبەر صلى الله علیە وسلم فەرمووی : ( إن الله خلق آدم على صورته ) جا لێرە وشەی على صورته (ه)ی کۆتایی بۆ کێیان دەگەڕێتەوە ؟

ئایا (هـ) بۆ خوا دەگەڕێتەوە یان بۆ ئادەم دەگەڕێتە یان بۆ منداڵەکەی ؟ بەشێوەی ڕوونتر واتا ، ئایا مەبەست پێی ئەوەیە خوا ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست کرد ؟ یان ئادەمی لەسەر شێوەی ئەو منداڵە دروست کرد .

جا ئەم نەصەیە کە ابن خزیمە نەفی صوڕەی خوا ناکات و تەئویلی ناکات بەڵکو ئەم فەرموودە تەفسیر ئەکات کە ئایا صورە لێرەدا مەبەست پێی صورەی الله یە یان ئادەم یان منداڵەکە جا بە پێی لێکدانەوەی بۆ زمانی عەرەبی ابن خزیمە بەوە تەفسیری کردوە کە وشەی (هـ) دەگەڕێتەوە بۆ منداڵەکە ٠

بۆیە ابن خزیمە فەرموویەتی ـ هەندێ لەوانەی کە زانستیان نەپشکنیوە وا تێگەشتون کە فەرموودەی : "علی صورته " وایان لە یەك داوەتەوە کە مەبەست پێی ڕوخساری الله یە جا مانای وتەکەی صلی الله علیه وسلم کەفەرمووی : خلق آدم علی صورته ٠ جا پێغەمبەر مەبەستی ئەوەیە کە الله ئادەمی دروستکرد لەسەر شێوەی ئەو منداڵەی کە لێی دراوە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بە گەورەکەی دوور کەوێتەوە لە لێدان لە ڕوخساری ٠

کەوابوو ابن خزیمە لێرە کە بەو شێوە تەفسیر دەکات مەبەستی ئەوە نەبووە سیفەتی ڕوخساری خوا پەك بخات نەخێر چونکە وەك باسمان کرد ابن خزیمە جێگیری سیفەتی ڕوخسار دەکات بەڵکو لێرە تەنها لە لێکدانەوەکەیدا تەئویل دەکات ئەویش نەك بۆی ئەوەی پەکی سیفەتی ڕوخسار بخات ، بۆیە ئەو وتەیە بەسەر ابن خزیمە جێگیر نابێت کە پێی بوترێ جەهمیە ، جا ئەگەر کەسێ بڵێ ئەی چی دەڵێین لەسەر ئەو وتەیەی ئیمامی احمد کە هاتووە ؟ پرسیارکرا لە ئیمام احمد پیاوێك دەڵێت : فەرموودەی (خلق الله آدم علی صورته ) ( ڕوخسار ) واتا ڕوخساری پیاو ٠

ئیمام احمد لە وەڵامدا فەرموویەتی درۆی کرد ئەو کەسە ئەوە وتەی جەهمیەکانە ٠ روی الطبراني عن عبد الله بن أحمد ٠

جا ئایا ئەو وتەیە دائەبەزێتە سەر ابن خزیمە ؟ بێگومان نەخێر بە چەند شێوەیەك :

١-ابن خزیمە هەر هەموو سیفەتەکانی خوا جێگیر دەکات هەروەك چۆن ئیمام احمد و سەلەفی ساڵح جێگیری دەکات ، بەڵام جەهمیەکان جێگیری ناکەن ٠

٢-ابن خزيمة رحمه الله ڕوخسار بۆ خوا جێگیر دەكات وەك باسمانكرد هەروەك چۆن ئیمام احمد و سەلەف جێگیریان كردوە ٠ بەڵام جەهمیەكان لە پشت ئەو تەئویلكردنە بۆ ئەو فەرموودانە مەستیان ئەوەیە نەفی سیفەتی ڕوخساری خوا بكەن هەر بۆیە ئیمام احمد فەرمووی ئەوە وتەی جەهمیەكانە واتا ئەوان نەفی ڕووخسار و وێنەی خوا دەكەن بەو تەئویل كردنە هەروەك چۆن نەفی سیفەتەكانی تر دەكەن جا ابن خزیمە بەو تەئویلە مەبەستی نەفی سیفەت ڕوخساری خوا نییە بەڵكو خۆی بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ چەسپاندنی ڕوخسار و وێنەی خوا ئەمەش جیاوازیەكی گەورەیە ٠

٣-ابن خزیمة فەرمودەكانی تر كە لە بارەی وێنەی خواوە هاتوون تەئویلی نەكردوە وەك فەرموودەی ( فیأتیهم الله في صورته التي يعرفون ) جا ابن خزیمە بەو فەرموودە وێنەی خوای جێگیر كردوە هەروەك چۆن ئیمام احمد و سەلەف بەو فەرموودە وێنەی خوایان جێگیر كردوە ٠

٤-ابن خزیمة نەفی تمثیل كردنی خوای كردوە بە مخلوقات هەروەك چۆن امام احمد و سەلەف نەفی ئەوەیان كردوە .جا ابن خزیمە موافەقەی هەموو سەلەفی كردوە لە هەموو ئەوانەی باسكرا خیلافەكە تەنها لە دەلالەتی فەرموودەكە دروست بووە ئایا وشەی (صورته ـ هـ ـ ) بۆ كێ دەگەڕێتەوە ٠

٥-ابن خزیمة بە هۆی چەند پاڵپشتێك ئەو لێكدانەوەی خۆی سەر خستووە چونكە فەرموودەكە بە سەڕیحی ئاماژە ناكات بەوەی ئایا وشەی علی دەگەڕێتەوە بۆ وێنەی خوا یان ئادەم یان منداڵەكە ٠ بۆیە ابن خزیمە پێشەوایەكە لە پێشەوایانی سەلەف اثبات هەموو ناو و سیفاتەكان خوای كردوە بە وێنە و ڕوخسارەوە بەبێ شوبهاندنی بە مخلوق بەڵام تەنها لە تەفسیر كرد یەكێك لە فەرموودەكان بە ڕاستێتی تێ نەگەیشتووە ئەویش بەبێ ئەوەی لە پاڵ ئەوە تەئویلە نەفی وێنە بكات نا بەڵكو وەك باسكرا اثبات وێنەی خوا دەكات بە بەڵگەوە ، بۆیە هیچ بێ ڕێزیەك و تانەیەك نابێت بدرێت لەو ئیمامە بەرێزە تانەدان لێی و وەسف كردنی بە شتێ كە تێیدا نەبووە ئەوە نیشانەی جەهل و حەسودی ئیمامەی اهل سنە ، وصل الله وسلم علی نبینا محمد ٠

لەکۆتاییدا ئەمە دێنمەوە یادی خەواریجەکان کە تەکفیر کردنی زانایانی پێشین و زانایانی اهلی تەوحید بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر خەوارج بوونیان چونکە تەکفیری زانایان دەکەن بە نەزانین و بەهۆی تێنەگەشتنیان لە وتەی ئەو زانایە و یاخود بەهۆی ڕقبوونیان لەو زانایانە یاخود بەهۆی چاولێکەری یاخود بەهۆی ئەوەی ئەو زانایانە قسەیەکیان وتووە پێچەوانەی عەقڵی ئەوان بووە بۆیە دێن تکفیری زاناکان دەکەن بە ناهەق بەبێ بوونی هیچ کوفر و بیدعەیەك لەو زانایانە ئەمەش ئەوان دەکاتە خەوارج کە خەوارج هەڕەشەی توندیان لەسەر هاتووە خیلاف هەیە ئایا خەوارج کافرن یان موسڵمان ؟

بە خەواریجە نوێیەکانی سەردەم دەڵێم ئەوانەی تکفیر ابن خزیمە و ابن تیمیە و محمد بن عبدالوهاب و ائمەی دعوەی نجدی موەحیدان دەکەن پێتان دەڵێم دڵنیابن ئێوە لە نێوان دوو بۆ چوندان یەکیان ئەوەیە مورتەدن لای هەندێ لە هاوەڵان و تابعین ئەوی تریشیان اهلی بیدعە و گومڕایین لە لای هەندێ لە زانایان .

ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە ابو ذر فەرموویەتی : رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی : لە پاش من لە ئومەتەکەم گەلێك پەیدا ئەبن قورئان ئەخوێننەوە بەڵام لە قوڕگیان ناچێتە خوارەوە لە دین دەردەچن هەروەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت پاشان ناگەڕێنەوە بۆ ناو دین ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانی خوان .
بڕوانە ئەو بەشەی کەفەرمووی : ( يَخْرُجُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَخْرُجُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ ) لە دین دەردەچن هەروەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت .

عبد الله ابن الامام أحمد فەرموویەتی ( أَبُو خَيْثَمَةَ زهير بن حرب بۆی گێڕامەوە لە عُمَرُ بْنُ يُونُسَ الْحَنَفِيُّ ئەویش لە عِكْرِمَةُ بْنُ عَمَّارٍ ئەویش لە شَدَّادُ بْنُ عَبْدِ اللهِ ، کە وتویەتی ابو ئومامە وەستابوو لەگەڵ سەرانی خەوارجەکان منیش لەگەڵ ابو ئومامە بووم لە لای دەرگای مزگەوتی حمص یان دیمەشق جا ئەبو ئومامە پێیانی وت ( واتا بە خەوارجەکانی وت ) سەگەکانی دۆزەخ دوو جار یان سێ جار ئاوای وت وە ( ئەبو ئومامە دیسانەوە) وتی ( خەوارجەکان ) خراپترین کوژراون لە ژێر ئاسمان و وە باشترین جەنگاوەر ئەوەیە کە دەیان کوژێت . چاوەکانی ئەبو ئومامە فرمێسکی لێ دەر دەچوو ( کە ئەو قسانەی دەکرد ) پیاوێك وتی (

ئەی ئەبو ئومامە ) ئەوە ئاگات لەو وتەیەت هەیە کە دەڵێیت ئەوانە خراپترین کوژراو لە ژێر ئاسماندا ئەمانەن وە باشترین جەنگاوەر ئەوەیە کە ئەمانە بکوژێ ئایا ئەمە بۆ چونی خۆتە یان لە پێغەمبەرت بیستوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟

ئەبو ئومامە وتی بۆ چونی خۆم ؟ ئەگەر وابێ من کەسێکی بوێرم بەرامبەر بە دینی خوا ئەگەر من ئەمەم نەبیستایە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جارێك یان دوو جار یان حەوت جار ئەوا بۆ ئێوەم نە دەگێڕاویەوە .

پیاوەکە وتی ( ئەی ئەبو ئومامە ) بینیم فرمێسکت ڕشت ؟ ئەبو ئومامەش فەرمووی ئەوە ڕەحمەتێك بوو ڕەحمم پێیان کرد کە ئەوان لە پێشتر ئیمانداربوون بەڵام دوای ئەو ئیمانە کافربوونەوە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ( وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ [ ١٠٥ ] يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ) سورة آل عمران آية ١٠٥-١٠٦ " ) السنة

ئەمە بەڵگەیە کە لە ناو صەحابە هەبووە تەکفیری خەوارجیان کردوە بەهۆی عقیدە بۆگەنەکەیان کە پێیان وابووە بەس خۆیان موسڵمانن وە تەکفیری هەموو موسڵمانان دەکەن ئیلا ئەوە نەبێ کە موافق بێ لەگەڵ خۆیان وە پێیان وابووە جگە لەوان موسڵمان نییە ئەم صەحابە بەڕێزە تەکفیری خەوارجی کردوە کە فەرمووی : ( رَحْمَةً رَحِمْتُهُمْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ فَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ )

خەوارجی ئێستا دەڵێن : گەر تکفیری عام نەکەی کافری ، گەر تکفیری ابن تيميه و ابو حنيفه و نجدیەکان نەکەی کافری ، گەر تەکفیری ئەوانە نەکەی کە وەك ئێمە بیرناکەنەوە کافری ، بە پوختی لای ئەمان هیچ تائیفەیەك نییە اهلی بیدەع بێ هەمووی کافرە لایان پێیان وایە بەس خۆیان موسڵمانن .

لە مسند أبو داود الطيالسي هاتووە: ( الْحَشْرَجُ پێمانی ڕاگەیاند کە سَعِيدُ بْنُ جُمْهَانَ وتی هاتم بۆ لای عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى هاوەڵی رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێی وتم تۆ کێ ی ؟ جا

ئەو کاتە ئەو هاوەڵە بەڕێزە نابینابوو (بۆیە وتی تۆ کێ ی) منیش وتم من سَعِيدُ بْنُ جُمْهَانَم عبدالله فەرمووی باوکت چی کرد ، وتم ئەزارقەکان کوشتیان ، وتی ڕەحمەت خوا لە باوکت بێ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : هەواڵی پێمانداوە کە ئەوانە سەگی ئاگرن

عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى

ابو عبد الله ابن حامد رحمه الله فەرموویەتی : (وَمَنْ كَفَّرَ أَهْلَ الْحَقِّ وَالصَّحَابَةَ وَاسْتَحَلَّ دِمَاءَ الْمُسْلِمِينَ بِتَأْوِيلٍ فَهُمْ كُفَّارٌ بلَا خِلَافَ فِيهِ )

هەر کەسێ تەکفیری ئەهلی هەق بکات وە تەکفیری صەحابە بکات خوێنی موسڵمانان حەڵاڵ بکات بە تەئویل ئەوا ؟ کافرە بەبێ هیچ ڕا جیاییەك . اختيارات ابن حامد في الفقه والأحكام

خەوارجی ئێستا تەکفیری ئەو موحیدە بۆ خوا سوڵحاوانە ئەکەن کە هەموو گیان و ژیانی خۆیان کردۆتە قوربانی گەڕانەوەی شەرعی خوا .

هەر ئەو ئیمامە بەڕێزە فەرموویەتی : ( کوفری خەوارج و ڕافیزە و قەدەری و مورجیئەکان چەندان فەرموودەی توندی لەسەر هاتووە )

خەوارج ئەوەی لەسەر هاتووە کە ئیمامی احمد بە سەندەوە لە ابی سعیدالخدری گێڕاویەتیەوە : کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی : ( يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لَا يَعُودُونَ فِيهِ حَتَّى يَعُودَ السَّهْمُ فِي فُوقِهِ، فَاقْتُلُوهُمْ هُمْ شَرُّ الْبَرِيَّةِ )

وە ئەو ڕیوایەتی عبد الله بن أحمد کە أبي أمامة - رضي الله عنه — گێڕاویەتیەوە کە لە بارەی خەوارجەوە وتوویەتی لە بارەیانەوە : ( كانوا مؤمنين فكفروا بعد إيمانهم ثم پاشان ئەو ئایەتەی خوێندوە ( فأما الذين اسودت وجوههم أكفرتم بعد إيمانكم ) وە لەسەر ڕافیزەش ئەوە هاتووە کە حرب بەسەندەوە لە ابن عباسەوە گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کە فەرموویەتی : ( سيكون في آخر الزمان قوم ينتحلون مودة أهل بيتي هم الرافضة، فمن أدركهم منكم، فيقاتلهم فإنهم مشركون )

لەکۆتایی زەماندا گەلێك پەیدا ئەبن خۆیان ئەدەنە پاڵ اهل و بەیتی من ئەوانیش ڕافیزەن هەر کەس لە ئێوە پێیان گەشت بیان کوژێ چونکە ئەوان موشریکن وە قەدەریەکان و مورجیئەکان ( بە ناو سەلەفیەکانی ئەمڕۆ ) .

حرب لە معاذ بن جبلەوە گێڕاویەتیەوە فەرموویەتی رسول الله - صلى الله عليه وسلم - : ( ألا وإن صنفين من أمتي لا يدخلون الجنة المرجئة و القدرية ) بێگومان دوو دەستە لە ئومەتەکەم ناچنە بەهەشتەوە ئەوانیش مورجیئە و قەدەریەکانن .

وە ابن بطة بە سەندەوە لە ابن عباس گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم ( صنفان من أمتي ليس لهما في الإسلام نصيب : المرجئة و القدرية ) دوو تاقم لە ئومەتەکەم هیچ بەشێکیان بوو نییە لە ئیسلام ئەوانیش مورجیئە و قەدەریەکانن .

وە هەر ابن حامد فەرموویەتی : ( وأنتم بإجماع الأمة مارقون، خارجون من دين الله، لا اختلاف بين الأمة في ذلك )

ئا ئێوە بە ئیجماعی ئوممەت دەرچوونە لە دین لە نێوان ئوممەتدا ڕاجیایی لەسەر ئەمە نییە التبيه و الرد ص ٤٥

ابن بطة العكبري فەرموویەتی ( ١٥٢- حسن بن محمد بن على خەوارجی کان الحسن بن محمد بن علي ( قەدەری و ڕافیزە و مورجیئەی ) بە موسڵمان نە دەبینی وە هەروەها خەوارجەکانی پێ موسڵمان نەبوو . الابانة الصغرى

ئەو ڕیوایەتەشی کە هاتووە کە ئیمامی علی فەرموویەتی ئەوانە لە شیرك هەڵهاتوون وە مونافیقیش نین بەڵکو برامانن .

ئەم ڕیوایەتە زەعیفە

ابن شيبة لە مصنفەکەی گێڕاویەتیەوە : (ثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ ، عَنْ شَرِيكٍ ، عَنْ أَبِي الْعَنْبَسِ ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ ، قَالَ : سُئِلَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ أَهْلِ الْجَمَلِ : أَمُشْرِكُونَ هُمْ ...... ؟ )

زەعیفە لەڕووی سەنەدەوە چونکە ابو البختری ئیمامی علی نەبینوە ڕیوایەتەکە دەبێتە مرسل

وە ئەوەشی ئیمام ابن کثیر گێڕاویەتیەوە : ( قَالَ الْهَيْثَمُ بْنُ عَدِيٍّ : ثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِدٍ ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ جَابِرٍ قَالَ : سُئِلَ عَلِيٌّ عَنْ أَهْلِ النَّهْرَوَانِ أَمُشْرِكُونَ هُمْ ؟ فَقَالَ : مِنَ الشِّرْكِ فَرُّوا ..... )

الهيثم بن عدي

ابن أبي حاتم : دەڵێت پرسیارم لە باوکم کرد لە بارەیەوە فەرمووی وازهێنراوە لێی لە وەرگرتنی فەرموودە

النَّسَائِيُّ وَ جگە لەویش وتوویانە مَتْرُوكُ الْحَدِيثِ

ابْنُ مَعِينٍ وَأَبُو دَاوُدَ : وتوویانە درۆزنە كَذَّابٌ.

البخاري دەفەرمووێ لێی بێ دەنگ بوونە وە وتراوە درۆزنە .

ئەوەشی البيهقي گێڕاویەتیەوە : ( أَخْبَرَنَا أَبُو عَبْدِ اللَّهِ الْحَافِظُ وَأَبُو سَعِيدِ بْنُ أَبِى عَمْرٍو قَالاَ حَدَّثَنَا أَبُو الْعَبَّاسِ : مُحَمَّدُ بْنُ يَعْقُوبَ حَدَّثَنَا هأَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ الْجَبَّارِ حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَلْعٍ عَنْ عَبْدِ خَيْرٍ قَالَ) (سُئِلَ عَلِيٌّ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ أَهْلِ الْجَمَلِ فَقَالَ : إِخْوَانُنَا بَغَوْا عَلَيْنَا (فَقَاتَلْنَاهُمْ وَقَدْ فَاءُوا وَقَدْ قَبِلْنَا مِنْهُمْ )

احمد ابن عبد الجبار:

ابن أبي حاتم : دەفەرمووێ شتم لێی وەردەگرت بەڵام وازم هێنا دوای ئەوەی زۆری وتەی خەڵکم لەسەری زانی وە مطين وتوویەتی درۆزنە وە أبو أحمد الحاكم وتوویەتی بەهێز نییە ابن عدي فەرموویەتی هەموو خەڵکی عێراق یەك دەنگبوونە لەسەر زەعیف دانانی التهذيب ١٢/ ٣٢